د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# ڕێزمانی کوردی



بەرگی یەکەم

## (وشە سازی)

بەشی دووەم

## - جێناو -

بەغدا - ١٩٨٧

کۆماری عێراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە ( ١٥٨ )

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# ڕێزمانی کوردی

بەرگی یەکەم

## (وشەسازی)

بەشی دووەم

## جێناو

بەغـــدا ـ ١٩٨٧

# پێشەکی

دەربارەی ئەوەی جێناو چییەو ئایا لە زمانی کوردیدا بەشـــێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن ، باسێکی یەکجار گرانو پڕ کێشـەیە • ئەمە بەتایبەتی پێوەندی بەو جۆرانەوە هەیە ، لە کاتێکدا کە جێناون ، دەکرێ لە هەمان کاتدا لە ڕیزی بەشە ئاخاوتنێکی تر دابنرێن • لە ڕاستیدا ئەگەر وشەیەك لە بنەڕەتدا ناوبێ نالوێ لـــە هەمان کاتدا لـــە ڕیزی ئاوەڵناو یان ژمارە دابنرێ[1] ••• بەلاّم هەرچی جێناوە بە شـــێوەیەکی ترە ـ واتە هەر جێناوێك لە یەك کاتدا لەگەڵ بەشـێکی تری ئاخاوتندا نزیك دەبێتەوە • بەوێنە جێناوی کەسی جودای ( من ، تۆ ، ئەو ••• ) لە ناو نزیك دەبێتەوە ، جێناوی نیشانەی ( ئەم ، ئەو ••• ) لە ئاوەڵناو نزیك دەبێتەوە •••

بۆیە کێشەی ئەوە دێتە پێشەوە : بەگشتی پیویست دەکا جێناو وەك بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ جیابکرێتەوە ؟ و بەتایبەتی گوێنەدرێتە ئەوە ، کە بەشێکیان ( من ، تۆ ، ئەو ••• ) لە ناو نزیكدەبنەوەو بەشێکیتریان ( ئەم ، ئەو ••• ) لە ئاوەڵناوو •••هتد • یاخود ڕاستتر وایە جێناو وەك گرووپێکی ڕێزمانی جیانەکرێنەوەو بەسەر ئەو بەشە ئاخاوتنانەدا دابەش بکرێن ، کە نیشانەی وێکچوون لە نێوانیاندا هەیە • هەندێ لە زآنایان بەم جۆرەیان کردووەو بەسەر ناوو ئاوەڵناو ••• دا دابەشیان کردووە •

لە ڕێزمانی چاولێکەریی کـــوردیو گەلـــێ زمانی تردا ، زاراوەی ( جێناو ، ڕاناو ـ Pronoun ) زۆر جار تەنیا بۆ ئەو وشـــــــانە

---

(1) بێگومان لێرەدا مەبەست گوێزانەوەی وشە نییە لـە بەشـــــێکی ئاخاوتنەوە بۆ بەشـــــێکی دی . بەڵێ ناو دەشێ وەك ئـاوەڵنـاو بەکاربهێنرێ ، بەلاّم ئەو وشـــــەیە ناشێ لـەیـەك کاتدا ناویشو ئاوەڵناویش بێ .

بەکاردەهێنرێن ، کە لە ڕستەدا هەمان دەوری ناو دەبینن ، واتە زاراوەی ناوبراو لە ڕووی ئێتیمۆلۆژییەوە بە واتای دەقاودەقی ( جێ ـ ناو ، ڕا ـ نـــاو ) ـ (Pro - noun) وەردەگرن ، کە گوایا لە جێی ناو ، لە بریتی ناو دێت ... بەو پێیە وشەی وەك ( ئەم ، ئەو ... ) و گەلێکی تر کە ئەرکی ئاوەڵناو بەجێدێنن نابێ لە ڕیزی جێناو دابنرێن .

دیارە پێویست ناکا بە دوورو درێژی لە نامەنتیقیو ناڕاســـتیی ئەو جۆرە تێگەیشتنەی جێناو بدوێین ، کە تەنیا لەسەر بناغەی ئێتیمۆلۆژیی زاراوەکە بنیاتنراوە . لە ڕاســـتیدا ئەگەر وشەی ( هی ، ئەم ، چەند ، چۆن ... ) جێناو نەبنو ئاوەڵناو بن ، لەســـــەر بناغەی ئەوەی جێی ناو ناگرن . بەڵکو لە بریتی ئاوەڵناو دێن ، ئەوە ئاشکرا نییە ، بۆچی وشەی وەك : ( من ، تۆ ... ) هەر ئەو ئەرکە دەبینن کـــە ناو دەیبینێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە ناو دانانرێنو وەك کۆمەڵە وشـــەیەکی تایبەتی بەناوی جێناوەوە جیاکراونەتەوە . کەواتە ئەگەر ( هی ، ئەم ، چەند ، چۆن .. ) بە ئاوەڵناو دابنرێن ، ئەوە دەبێ بە پێی هەمان تێگەیشـــــتنو بۆچوون وشەی ( من ، تۆ ... )ش بە ناو بژمێررێن .

بەر لەوەی وەڵامی ئەو پرســـــیارە بدەینەوە کە جێناو چییەو ئەو گرووپە بۆ جیاکراوەتەوە ، هەندێ لە خاسیەتی دەدوێین :

**تایبەتێتی جێناو لە ڕووی واتاوە :**

لە بەرانبەر یەکتر ڕاگرتنی جێناو لەگەڵ وشـــەی تردا ئەوەی هەرە سەرەکییەو زۆر دیارەو زۆر دێتە پێش‌چاو ، تایبەتێتی خاسیەتی واتایەتی . بەوێنە جێناوی کەســـی کاتێ لـــە ڕســـتەدا وەك ناو ئەرکی نیهاد دەبینێ ( کوڕەکە گوێزەکەی شکاند ـ ئەو گوێزەکەی شکاند ) لە ڕووی واتاوە زۆر لـــە نـاو جیـــاوازە . جیـــاوازی لـەگـــەڵ نـاو بـەتـایبـــەتی لـــەوەدایـــە هیـــچ جێنـــاوێـــکی کـەســـی هەمیشـــەیی نییـــەو بەنـد

نییەو ناوی گیاندارێك یان بێ گیانێك یان بیرێك یان کارێك نیشان نادا • بەوێنە « خانوو » کە شتێکی چەسپاوی شێوە دیارەو هیچ بەند نییە بەوەی کەی و لەکوێ باسی لێوەکراوە • ئەم شتە لە هەموو حاڵێکدا هەر ئـەو وشەیە ناوێتی • هەرچی جێناوە بەو جۆرە نییە ، بە نموونە جێناوی ( من ) بە پێی شوێن دەشێ پێوەندی بە پیاوەوە یان بە ژنەوە ، بە منداڵەوە یان بە گەورەوە ، تەنانەت بە ئاژەڵو بێ گیانیشەوە هەبێت • لەگەڵ ئەوەشـــدا وشەی ( من ) بۆ هیچ کەسێك ناوبردنێکی هەمیشـەیی نییە • لە سەروو هەموو شتێکیشەوە بێ خوێندنەوەی شوێن وشەی ( من ) بەگشتی هیچ ناگەیەنێ ، واتە بەوێنە ئەگەر لەسەر وتارێك بنووسرێ ( ئازاد ) ، ئـەوە کەسێکی دیاری کراو نیشان دەدا ، بەڵام بێتو لەجێی وشەی ( من ) دابنرێ ، ئەوە خاوەنی ناناسرێ ••• جێناوی کەســـی واتای گیاندارو بێ گیان بە شێوەیەکی نیسبی دەگەیەنێ • نەك بە شێوەیەکی گشتی ، واتە لە ڕووی پێوەندیی ئەو ئاخاوتنەوە : جێناوی کەســـی یەکەم ــ قســـەکەر ، واتە خاوەنی قسە نیشان دەدا ؛ جێناوی کەسی دووەم ــ قســـەبۆکراو ، واتـە بەشداری کەری قسە دەردەخا • جێناوی کەسی سێیەم ــ قسەلێ کراو ، واتە بەشداری نەکەری قسە دەگەیەنێو بۆیە بە بێ بایەخی دادەنێین •

ئەو جۆرە خاسیەتو تایبەتێتی یانە ڕوونو ئاشکرا لە واتای ( جێناوی نیشانە )شدا دەردەکەون ، کە لەگەڵ ئاوەڵناودا بەراورد دەکرێ • بەوێنە لە دەستەواژەی « ئەم خانووە » یان « ئەو خانووە »دا ئاشکرا دیارە کـە قسە لەبارەی کام خانووەوە دەکرێ ، تەنیا لەبەر ئەوەی حاڵەتی دیاری کردن نیشانی داوە ، بەڵام زانینی چۆنیەتی ( ئەم خانووە ) یان ( ئەو خانووە )ە بەبێ نیشاندانی حاڵەتی ئاخاوتن ناشێ • ( خانوو ) ، کە هەر ئێستا لە ڕێی ( ئەم )ەوە واتای گەیاند . لەباری گۆڕینی حاڵەتی ئاخاوتندا وای لێهات لە ڕێی ( ئەو )ەوە مەبەست بگەیەنێ • بەم چەشـــنە بەکارهێنانی جێناوی ( ئەم )و ( ئەو ) بۆ شتی چەسپاو ، بێ گومان بارو دۆخی ئاخاوتن دیاری

دەکات . نەك خاسیەتی شتەکە ، وەك بڵێین « خانووی گەورە » ، « خانووی بەرز » ... جێناوی نیشانە خاسیەتی شتێك دەردەخا ، کە حاڵەتی ئاخاوتنەکە دیاری کردبێ .

ئەو خاسیەتو تایبەتێتی‌یانەی واتا کە ناومان‌بردنو پێوەندن بە بارو دۆخی ئاخاوتنەکەوە ، هەروەها لە جێناوی نەفی‌و پرسیاریشـدا هەیە . هەرچەندە لەماندا زۆر ڕوون دەرناکەون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو خاسیەتو تایبەتێتی‌یانەن کە جێناوی نەفی‌و پرسیار لە ناوو ئاوەڵناو جیادەکەنەوە . بۆ نموونە لە ڕستەی « **هیچ‌کەس نەهات** »دا جێناوی ( هیچ‌کەس ) نیشانی دەدا ، کە وا لەم حاڵەتەدا یەك کەس چییە دەوری کارای نەبینیوەو بەو پێیە ئەو هەواڵەی لەبارەیەوە قسەدەکرێ ، ڕووی نەداوە . هەر بەو چەشنە لە ڕستەی « **من هیچ شتێك نابینم** »دا (**هیچ‌شتێك**) ناوی شتێکی دیاری‌کراو ناباو نیشانی‌دەدا کە یەك شت چییە نەبووەتە بنکەی ئەم پرۆتسێسە . جێناوی نەفی ، بەم جۆرە واتای دەرهاویشتن دەگەیەنێ . ئەو جێناوانە هیچ کەسێك یان هیچ شتێکی دیاری‌کراو دەست‌نیشان ناکەن‌و ناوی هیچ نابەن ، بەڵکو تەنیا پەنجە بۆ ئەوە درێژدەکەن کە وا ئەو کەسە یان ئەو شتەی دەکرا بە شێوەیەکی ئاشکرا ناوی ببرێ یان خاسیەتی نیشان بدرێ ، نییە .

( جێناوی پرسیار )یش دیسان بێ‌بەرە لە ئەرکی ناوبراو . لە ڕستەی « تۆ چی دەکەی ؟ »دا پرسیارکەر تەنیا سەرنج بۆ ناوی شتێك ڕادەکێشێ ، بەڵام نەك بۆ شتێك کە وا وەك هەواڵێك یان شتێکی دیاری‌کراو جیاکرابێتەوەو لە شتی‌تر جیاوازبێ‌و ناونرابێ ( چی ) . هەروەها لە ڕستەی « کێ ئەوی بینی »دا ، کە وا ( کێ ) تەنیا نیشانی ئەوە دەدا ، ئەو کەسەی ئەم کارەی بەجێ‌هێناوە لێمان ئاشکرا نییە . بەم جۆرە جێناوی پرسیار نیشانی دەدا ، کە وا شتێك ئاشکرا نییەو داوا دەکا ئاشکرا بکرێ ، ئەو شتە چییە .

بەم پێیە بۆ واتای جێناو ئەوە مەرجە ، کە بـە هاریکاری ئەو هیچ شتێك ناونابرێ ، بەڵکو تەنیا نیشـــانی خاسیەتی گشـــتی دەدات لەگەڵ پێوەندیو ڕێکەوتنی بە بارو دۆخی ئاخاوتنەوە • بۆیە مانای گشـــتیی جێناو دەشێ وەك ئیشارەت بۆ ئەم شت یان ئەو نیشـــانەیە ، کە حاڵەتی ئاخاوتن دیاری‌کردووە ، لێك‌دەرێتەوە • بە تایبەتێتیو واتای ئاشـــکرا دەبێ ، کە جێناو لە هەمیشەییو چەسپاوی بێ‌بەشە ـ واتە جێناو مانایەکی بەردەوامی شتێکی دیاری‌کراو ناگەیەنێ • جا ئەم بەردەوام نەبوونی واتایە ســـیفەتێکی بنەرەتیی جێناوەو ئەم تایبەتێتی‌یە هەموو جۆرەکانی جێناوی بەیەکەوە بەستووە •

وەك دەبینین لە واتای جێناودا پێوەندییەکی ناسـراو هەیە • لەبەر ئەوەی زۆر جار واتای هەمەجۆری پێوەندی بە دەوروبەرەوە نەبەستراوە، بۆیە وەك دەربڕینی ڕێزمانی تەماشادەکرێ • بەم پێیە لە زۆر حاڵەتدا وا ڕادەگەیەنرێ کە وا جێناو لە ڕووی واتاوە خاسیەتی ڕێزمانی هەیە •

بەو تێ‌گەیشتنە بەشێکی ناسراو لەو ڕاستییە هەیە • بە نموونە واتای کەس کە خاسیەتی جێناوی کەسییە لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ حاڵاتی ڕێزمانیی کەس لە کرداردا وەك یەکن • لەم ڕستەیەدا « من دەنووســـم » جێناوی ( من ) هیچ کەسێکی دیاری‌کراو ناو نابا ، بەڵـــکو تەنیـا پەنجە بۆ خاوەنی قسەکە درێژدەکا ، کە وا لە هەمان کاتدا جێ‌بەجێ‌کەری ( کارا )ی ڕووداوە بەجێ‌هێنراوەکەیە ••• ئەمەش بەوێنە لەگەڵ « ئێوە دەنووســــــن »دا جیاوازی هەیە ، کە وا قسەکەرو نووسەر کەسانی جیاوازن •• دیسان هەمان واتای کەسی یەکەم لە قاڵبی کردارەکە ( دەنووسم )دا دەردەکەوێ • بەڵێ لە ( دەنووسم )دا هەروەها واتای ڕێژەو کاتو شـــتی دی هەیە ، کەچی لە ( من )دا سەرنج تەنیا بۆ واتای کەس ئاراستەکراوە • بەڵام ئەو جیاوازییە چەندێتی‌یەو بە واتای چۆنێتی ( لــــە ڕووی ڕاگەیاندنی واتای

کەسەوە ) ـ ( من )و ( دەنووسم ) وەك یەکن • ئەمە ئەوە ئیسپاتدەکا کە لە زۆر زماندا کە لە ڕێژەی کرداردا کەس هەبێ ، جێناوی کەسیی جودا دەشێ بەکار نەهێنرێ • بەوێنە ئێمە لە زمانی کوردیدا کاتێ لـە کردارەکەدا نیشانەی کەس بەباشی دیارە ، جێناوی کەسیی جودا دەپەڕێنین : ( من ) دەنووس ـ م ، ( ئێمە ) دەنووس ـ ین•••(٢)

بەو چەشنە واتای جێناوی کەسیی جودا لەگەڵ واتای کەس لە قاڵبی کرداردا وەك یەکن • بـەلاَم لەبەر ئەوەی کەس لـە کرداردا واتایەکی ڕێزمانیی هەیە ، بۆیە دەکرێ کێشەی واتای ڕێزمانی لە جێناوی کەسیدا بهێنرێتە ناوانەوە •

**جیاکردنەوەی جێناو وەك وشە :**

سەربەخۆیی جێناوی کەسـیی جودا جێگەی گومان نییە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە زانایان وەك وشەی سەربەخۆیان تەماشا ناکەن •

جێناوەکانی ( من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان ) کە لەگەڵ کرداردا بۆ نیشاندانی کەس بەکاردەهێنرێن ، بریتین لە وشەی سـەربەخۆ ، نەك پارچەیەك لەقاڵبی کردارەکە • ئەویش لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە :

أ ـ ئەو دانانە خاوەنی بزووتنەوەیەکی چالاکن لە ڕستەدا • لەمەدا خاسیەتی لە گەلێك باری گرنگدا بەتەواوی وەك ناو وایە • بەنموونە :

**ئەو هات / ئازاد هات**

**ئایا ئەو منی بینی ؟ / ئایا ئازاد منی بینی ؟**

**ئێوە هیچ کات نانوون / کرێکاران هیچ کات نانوون**

---

(٢) لە زمانی ڕووسـیدا بە هەمان چەشن جێناوی کـەسیی جـودا دەپەڕێنرێ ، وەك : « ( یا ) ـ پیش ـ و » / « ( من ) ـ دەنووس ـ م » ••• لە زمانی ئینگلیزیدا لـە بارو دۆخی تایبەتێتیدا ( لـە زمـانی ئاخاوتندا ، لە یادداشتدا ••• ) ، هەروەها جێناوی کەسـیی جودا دەپەڕێنرێ •

**ئەو لەسەرخۆ ڕۆیشت / ئازاد لەسەرخۆ ڕۆیشت**
**... هتد .**

بەمچەشـــنە ئەگەر ئەو دانانە هەروەها پارچەی قاڵبی کردار بن ، ئەوە تەنیا لەبارو دۆخێکدا . دەبێ وابێ ، کە وا ئەو جۆرە قاڵبانەی کردار وەك قاڵبی تەحلیلی تەماشابکرێن ـ واتە وەك ئەوانەی کە وا واتای ڕێزمانی بە پارچەی ئەو قاڵبە دەردەبڕێ ، کـە بـە ڕوخسار **خاسیەتی وشـــەی ســـەربەخۆی تێدایە** . ئەگەر بەپێچەوانەوە بیربکرێتەوە ، ئەوە دەبێ : ١ ـ یاخود ئافیکسێکی ڕێزمانیی ئاسایی بێو جا ئەوسا ئیتر نەیدەتوانی وەك ناو دەور ببینێ ؛ ٢ ـ یاخود نەك تەنیا بە ڕوخســـــار ، بەڵکو لە واقیعیشدا وشەیەکی سەربەخۆ بێ ... بۆچوونی یەکەم لاوازە ، چونکە لەگەڵ هەڵکەوتیدا ڕێكناکەوێ . بەڵام ئەگەر ( من ، تۆ ، ئەو .... ) بەشێکی قاڵبی تەحلیلی نەبن ، ئەوە وشەی سەربەخۆنو ناکەونە پێکهاتنی کردارەوە . بێگومان بۆچوونی دووەم پتر لە واقیعەوە نزیکە . دیارە دانەکانی وەك ( من ، تـۆ ، ئـەو ... ) ، **خاســـیەتی وشـەیان تێدایـەو** وەك وشەی سەربەخۆ لەگەڵ کرداردا دێنو کەسو ژمارە نیشاندەدەن .

ب ـ جێناوی کەسیی ( من ، تۆ ، ئەو ... ) وەنەبێ تەنیا ئەرکی نیهاد ببینێ یان تەنیا کارای ڕستە نیشانبدات . ئەگەر « ئەوە منم » بـــە ( وردەگیریی ڕێزمانی ) دابنرێ ، خۆ « ئەوە تۆی » ؛ « ئەوە ئەوە » ... بێگومان دەربڕینێکی عادەتییە .

هەروەها ( من ، تۆ ... ) لە حاڵەتی وەهاشــدا : « بە هیچ جۆرێك من نەبووم » ؛ « هیچ کاریان بە من نییە » ؛ « تۆ بۆ لە من تۆراوی ؟ »... دەبینرێ .

جێناو بە چەشنێك فراوانو جۆربەجۆرە لە گەیاندنی واتای کەسدا ، ڕەنگە هەڵە نەبێ ، ئەگەر بوترێ بۆ ماوەیەك کردار لەبیر دەباتەوە .

ج ـ جێناوی ( من ، تۆ ، ئەو ... ) نەك تەنیا لە ڕستەدا شوێنی خۆیان دەگۆڕن بە شێوەی وشەی سەربەخۆی وەك ناو ، بەڵکو لەگەڵ ناویشدا دێنو ئەمەش پتر بەرانبەر بە ناو وەستانیان نیشان دەدا . بەنموونە :

**منو ئازاد پێکەوە چووین بۆ قوتابخانە .**

**نە منو نە ئازاد لێیان تێ نەگەیشتین .**

د ـ تاکو ئێرە دەربارەی واتاگەیاندنی کەسی یەکەمو دووەم دواین ، کە وا لە ڕستەدا شوێنێکی تایبەتیان هەیە . ئەوەی پێوەندی بە جێناوی کەسی سێیەمەوە هەیە ، ئاشکرا دەبینرێ ( ئەو )ە لەگەڵ ناودا دەکەوێتە یەك ڕیز ـ بەو واتایەی کە وا لەگەڵ ئەو جێناوەدا کۆتایی کردار چۆن دێت ، لەگەڵ ناویشدا بە هەمان چەشن دەردەکەوێ ، وەك :

**ئەو ڕۆیشت / ئازاد ڕۆیشت**

**ئەو خواردی / ئازاد خواردی**

**تایبەتیی جێناو لە ڕووی وشەسازییەوە :**

جێناو توانایەکی گەورەی هەیە بۆ یەکخستنی وشە لە یەك گرووپدا ، هەرچەندە ئەو هەموو وشانەی لە ڕیزی جێناودا کۆدەبنەوە زۆر هەمەچەشنن بە ڕوخسارو لە ڕووی پێکهاتنیشەوە پتر لەیەکتر جیادەبنەوە ، وەك لەوەی کە دەبنە بەشە ئاخاوتنێکی دی .

بەوێنە لەنێو ئەو جێناوانەدا ، کە لە ناو نێزیك دەبنەوە ، یاخود بە واتایەکیتر لە نێو جێناوی ناویدا ، چەند دەستەیەك وشە هەیە ، کە جیاوازیی ڕووکەشی لەگەڵ ناوی عادەتیدا هەیەو بە ڕێی جیاوازدا تێدەپەڕن :

**١ ـ جێناوی کەسی :**

بەر لەهەر شت ، ئەوەی لەنێو جێناوی ناویدا سەرنج ڕادەکێشێ ، ئەوەیە کە ئەم جێناوانە جیاوازییان لەگەڵ ناودا ئەوەیە :

بوونی وشـــه له زماندا حاڵەتێکی تایبەتی وەردەگرێ ، کە ئەویش تاکە هەڵگری واتای کەسی یەکەمو دووەمە • لە ڕاستیدا واتای خاوەنی قسە یاخود بەشداری قسە ؛ تەنیا لە جێناوی کەسی یەکەمو دووەمدا هەیەو لە وشەی تردا نییە • بەم بۆنەیەوە دەتوانرێ بوترێ کە وا ڕێبازی ڕێزمانی چاولێکەری ڕاست نییە لەوەدا کە وای داناوە ، گوایا جێناوی هـەر سێ کەسەکە بوونیان لە زماندا لەسەر بناغەی جیاوازە • لە ڕاستیدا لەو کاتەدا کە واتای کەسی یەکەم تەنیا لە جێناوی ( من ) و ( ئێمە )دا هەبێو واتای کەسی دووەم تەنیا لە جێناوی ( تۆ ) و ( ئێوە )داو واتای کەسی سێیەمی جێناوی ( ئەو )و ( ئەوان ) لەگەڵ ژمارەیەکی بێشومار لە ناو وەك یـەك دەردەکەون ، بە تایبەتی لە ڕوخساری قاڵبی کرداردا یەك دەگرنەوە •

لە جێناودا زۆر ڕوونو ئاشکرا تایبەتێتی بوونی کەس بەدی دەکرێ ، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی تردا بەرانبەر ڕابگیرێ ••• بەوێنە جێناوی ناوی جیاوازی لەگەل ناوی ئاســـــاییدا لەوەدایە ، کـە وا ناو ئەگەرچی هەمیشە بە واتای کەسی سێیەم دێت ، بەڵام بێگومان حاڵەتـی کەسی تێدا نییە •

٢ ـ جێناوی پرسیاری ( کێ ) و ( چی ) ، کە وا وەك جێناوی کەسی بەر جێناوی ناوی دەکەون . خاسیەتی سەرەکیان سنوورکێشانە لە نێوان کەسو شتدا • بە واتایەکی ڕوونتر جیاکردنەوەی مەبەســـت لە ڕووی گیانلەبەریو بێگیانییەوە • جێناوی ( کێ ) بۆ گیانلەبەر بەکاردێنرێ ( لە پێش هەموو شتێکیشەوە بۆ مرۆڤ ) ، بەڵام جێناوی ( چی ) بەکارهێنانی پێوەندی بە شتی بێگیانەوە هەیە •

بەگشتی جیاکردنەوە بەپێی بوونو نەبوونی گیانەوە بە ئاشکرایی لە ناویشدا هەیە • کەس لاری لەوە نییە ، کە وشەی « پیاو »و « پشیلە »و « خـانـوو » شـــــــــتێکی بێگیـــان دەگـەیـەنێو وشـــــــەی

« پشیله » گیانلەبەر • خۆ وشەی « پیاو » ، ڕەنگە هەڵە نەبێ ئـەگـەر بوترێ پتریش گیانلەبەرە •

بەڵام لە سیستەمی ناودا ئەو جیاوازییە وەك جیاوازییەکی سەربەخۆ دەردەکەوێ لە نێوان ئەو مەبەســـتانەدا کە ناونراون • لێرەدا لە ڕووی گیانداریو بێگیانیەوە بەرانبەر یەکتر ڕاگرتنێکی ئاشکرا نییەو ئەگەر واتای ناوێك نەزانرێ ، ناتوانرێ دیاری بکرێ ناوی کەسێکە یان شتێکە • هەرچی جێناوی ( کێ ) و ( چی )یە ، کاتێ بە مەبەستی پرسیار دێن ئاشکرا مەبەست بەسەر گیانداریو بێگیانیدا دابەش‌دەکەن • بەهۆی ئەمەوە لـە زماندا بەگشتی دیاری‌کردنی ســـنوور لە ڕێگای حاڵەتی بوونو نەبوونی گیانەوە ، باش دەردەخرێ ، ئەگەرچی ئاڵۆزیش دەبـــێ • بەوێنە مرۆڤ کاتێ باسی ناوی دەکرێ ( کێ ) بەکاردێ ، بەڵام کـــە دەربارەی کارو پیشەی قسەدەکرێ ( چی ) بەکاردێ • ئەمەش دیارە لەبەر ئەوەیە ، کـــە مرۆڤ گیانلەبەرەو شتێکی زیندووەو کارو پیشەش شتێکی بێگیانە •

٣ ـ جێناوی نەفیو جێناوی نادیاریش هەروەهـــا دەکەونە ڕیزی جێناوی ناویەوە • ئـــەم جـــۆرە جێناوانەش لـــە ڕووی گیانداریو بێگیانیەوە . جیاوازی نیشان دەدەن • وەك :

**کەس ، کەسێك ...**

**شت ، شتێك ...**

**هیچ ، هیچ‌کەس ، هیچ‌شت ...**

٤ ـ جێناوی نیشـــانە ( ئەم ، ئەمە ، ئەو ، ئەوە ... ) جیاوازی لەگەڵ ئەو جێناوانەی لە سەرەوە باسمان‌کردن ، ئەوەیە کە ئەوانە هەمیشە ئەرکی ناو بەجێ‌دێنن ، بەڵام ئەم چۆن ئەرکی ناو بەجێ‌دێنێ ، لـە هەمان کاتدا ئەرکی ئاوەڵناویش دەبینێ • بەوێنە بەراوردی ئەو دوو ڕستەیە بکە :

**ئەمە چییە ؟ ئەوە چییە ؟**

**ئەم پیاوەکە کێیە ؟ ئەو پیاوە کێیە ؟**

تایبەتێتی جێناوی نیشانەی ( ئەم ، ئەمە ، ئەو ، ئەوە ... ) لەوەدایە کە خاوەنی ژمارەن . ئەم تایبەتێتی ژمارەیەش تەنیا هەر لەو حاڵەتەدا نییە کە جێناون ، بەڵکو لەو حاڵەتانەشدایە کە وەك ئاوەڵناو بەدەردەکەون . بەوێنە بەراوردی ئەو ڕستانە بکە :

**ئەم پیاوە ـ ئەمان پیاون .**
**ئەو پیاوە ـ ئەوان پیاون .**

جگە لە جێناوی نیشانە هەروەها زۆر کۆمەڵە جێناوی تر دەتوانن دەوری ناو یان ئاوەڵناو ببینن .

**تایبەتێتی جێناو لە ڕووی ڕستەسازییەوە :**

تایبەتێتیو خاسیەتی جێناو لە مەیدانی ڕستەسازیشدا دەبینرێ .

جێناو لە ڕستەدا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە . بەوێنە ( ئەم ) و ( ئەو ) لە پلەی یەکەمدا دێن ، وەك : « ئەم خانووە گەورەیە » ؛ « ئەو خانووە گەورەیە » ... بەڵام ناوترێ « خانوو ئەم گەورەیە » ؛ « خانوو ئەو گەورەیە » ...[3]

**شوێنی جێناو لەنێو بەشەکانی ئاخاوتندا :**

بەگشتی هەموو حاڵەتێك ئەوە نیشان دەدەن ، کە جیاکردنەوەی جێناو تەنیا لە ڕووی واتاوە ڕاست نییە . هەروەك ناوو ئاوەڵناوو بەشە ئاخاوتنەکانی دی ، جێناویش کۆمەڵە وشەیەکە کە هەر لەسەر بناغەی خاسیەتی واتاوە جیانەکراوەتەوە . بەڵکو لەسەر بناغەی خاسیەتی ڕێزمان ( وشەسازیو ڕستەسازی )یش .

---

(٣) لەبەر ئەوەی لەم کتێبەدا لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لە جێناو دەدوێین ، بۆیە درێژەمان بە باسی تایبەتێتی ئەم بەشە ئاخاوتنە لە ڕووی ڕستەسازییەوە نەداوە .

ئەوەندە هەیە پێوەندیی نێوان خاسـیەتی ڕێزمانیو واتا لە جێناودا وەك ناوو ئاوەڵناو ... نییە . لە ناوو ئاوەڵناو ... دا نیشانەی ڕێزمانی دیاریدەکەن . کە ئەو وشەیە سەر بەو بەشە ئاخاوتنەیەو هەندێ جاریش لەگەڵ واتایدا جووت دێن .

هەر ئەو واقیعەی ، کە وا جێناوی وەك کۆمەڵە وشەیەکی سەربەخۆ لەسـەر بناغەی خاسـیەتی واتاو ڕێزمان جیاکردۆتەوە ، یارمەتی ڕوونکردنەوەی ئەوەش دەدا کە بۆچی وەك بەشـە ئاخاوتنێك لە بەرانبەر ناوو ئاوەڵناو دێت .

بەڵام پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین کە ئەگەر بتوانرێ جێنـاو ناوبنرێ بەشە ئاخاوتن ، ئەوە تەنیا لەو حاڵەتەدا دەبێ ، کە ئەو زاراوەیە بە واتایەکی فراوانتر تەماشابکرێ ، نەك وەك ئەوەی بە ( جێگری ناو ) لێكبدرێتەوە.. جگە لەوە . کە جێناو وەك بەشە ئاخاوتن ناودەبرێ ، پێویستە بزانین ، کە وا جیاکردنەوەی ، جیاوازی لەگەڵ جیاکردنەوەی ناوو ئاوەڵناوو بەشـە ئاخاوتنەکانی تردا هەیە . جا لەبەر ئەوەیە ، جیاکردنەوەی جێناو جیاوازی لەگەڵ دابەشکردنی بەشە ئاخاوتنەکانی تردا هەیەو وا دەبینرێ کە مەوداو سنووری جێناو لەچاو بەشە ئاخاوتنەکانی تردا بەرینترو فراوانترە . لـە ڕاستیدا ، وەك پێشتر باسمانکرد ، وشەیەك ئەگەر ناوبێ ناتوانی لە هەمان کاتدا کرداریش بێ ، بەڵام جێناو بە چەشـنێکی دیەو زۆر ئاڵۆزترەو خاسیەتی بەپێی باری ئاخاوتنەکە دەردەکەوێ[٤] .

**کورتـەی باس :**

دەوری جێناو لە زماندا ئێجگار گەورەو فراوانەو بۆیە جێناو یەکێکە لە باسە زۆر بایەخدارەکانی زمانەوانی .

---

(٤) أ. ی. سامیرنیتسکی ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسـکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ١٩٥ – ١٩٦ .

له جێناودا به شێوه‌یه‌کی بنجی دیارده‌ی که‌س‌و خۆیه‌تی‌و نیشاندان له پله‌ی یه‌که‌مدا دێن •

کێشه‌ی واتاو ئه‌رکی جێناو له لایه‌ن زمانه‌وانانه‌وه تا ڕاده‌یه‌ك به‌ جۆری جیاواز باس‌کراوه • هه‌ندێ جار په‌نجه بۆ ئه‌وه درێژکراوه ، که‌ جێناو له به‌رانبه‌ر دانه‌کانی تری زمان وه‌ك « وشه‌ی به‌تاڵ » وانو ته‌نیا له ڕسته‌دا مانا په‌یداده‌که‌ن • له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا جێناو واتای تایبه‌تیی خۆی هه‌یه ، که به شێوه‌یه‌کی ئاڵۆز پێکهاتووه • ده‌توانرێ جێناو وه‌ك ڕشته‌یه‌کی خاوه‌ن خاسیه‌تی هه‌مه‌چه‌شن بخرێته پێش‌چاو ، که ئه‌رکی هه‌مه‌جۆر به‌جێ‌دێنن‌و پێوه‌ندیی ئاڵۆزیان له‌گه‌ڵ یه‌کتر هه‌یه • هه‌ندێ له‌و خاسیه‌تانه به ته‌واوی ڕه‌نگی واقیعی تایبه‌تێتی جێناو ده‌ده‌نه‌وه ، وه‌ك که‌س‌و ژماره‌و خۆیه‌تی‌و ••• ، هه‌ندێکیش له‌و خاسیه‌تانه پێوه‌ندییان به ده‌وری ڕسته‌سازیی جێناوه‌وه هه‌یه ، که‌ له‌ پێکهاتنی ناوی یان کرداری‌دا ( له‌سه‌ربه‌خۆیی یان پێوه‌ندی‌دا ؛ له‌ کارایی‌و نیهادی یان به‌رکاری‌و گوزاره‌یی‌دا ) هه‌یه • سێیه‌م ـ پێوه‌ندیی جێناو به‌و دۆخه‌وه که له جێی ناو دێت‌و له‌گه‌ڵ ڕیشه‌ی ( مادی‌و مه‌عنه‌وی ؛ گیانداری‌و بێ‌گیانی ؛ جینس •••هتد )دا • هه‌موو فۆرمێکی جێناو خاسیه‌تی گشتیی جێناوی تێدایه ، که وا ده‌شێ خاسیه‌ته‌کان به خاسیه‌تی « به جێناو بوون » ناوببرێن •

جێناو وه‌ك ( جێگر )ی دانه‌یه‌کی واتادار خۆی ده‌نوێنێ ، به‌ڵام واتاکه‌ی وه‌رناگرێ • به‌وێنه ئه‌گه‌ر جێناوی ( ئه‌و ) له ڕسته‌ی « ئه‌و بگره »دا مه‌به‌ستی ( کچێك ) بێ ، ئه‌وه وا ناگه‌یه‌نێ که ( ئه‌و ) مانای ( کچێك ) ده‌گه‌یه‌نێ • جێناو له وشه‌یه‌کی واتادار ماناکه‌ی وه‌رناگرێ ، به‌ڵام نیشانی ئه‌وه ده‌دا ، که له‌م تێکسته‌دا قسه له‌باره‌ی به‌رکارێکه‌وه ده‌کرێ که ناوه‌و تاکه‌و ته‌واوکه‌ری ڕاسته‌وخۆیه •

## - ١ -

# کورتە هەڵسەنگاندنێکی
# ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی "جێناو" دا کراون

بەر لە هەر کەس مامۆستا سەعید صدقی کابان لە کتێبی « مختصر صرف‌و نحوی کوردی »دا بە ناوی « ضمیر »ەوە لەو کێشەیە دواوە[1]و دەڵێ : « ضمیر ـ دوو نەوعە ١ ـ متصل ، ٢ ـ منفصل » ( ل ٢٨ ) • لە سەرەتای باسی جێناوی کەسیی جودادا هەر شەش جێناوەکەی ( من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان )ی دەست‌نیشان کردووەو پاشان لەبارەی ئەرك‌و دەوریانەوە لە ڕستەدا نووسیویە کە « ضمیر منفصل ••• دەبێ بە فاعل ، دەبێ بە مفعول ، دەبێ بە مضاف الیە ••• » ( ل ٣١ )و ئنجا نموونەو بەڵگەی بۆ ئەو حاڵەتە جۆربەجۆرانە هێناوەتەوە ••[2] ئەگەرچی وایە ، کە مامۆستا سەعید صدقی « لە هەموو ڕوویەکیشەوە پەیڕەویی زمانی عەرەبی کردووە کە ئەوسا بۆ ئەو تاکە سەرچاوەی لێکۆڵینەوە بوو »[3] ، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستی‌یەش لەیاد نەکەین کە لە ڕێزمانی فارسیش‌دا شارەزا بووەو ئەم لێدوانەشی لە زۆر ڕووەوە لە هەندێ لەو باسانەی ئەم ساڵانەی دوایی لەبارەی جێناوی کەسیی جوداوە نووسراون زانستی‌یانەترو قووڵترە •• •

نووسەر جێناوە لکاوەکانی بەسەر دوو جۆری « ١ ـ متصل ئاشکرا ، ٢ ـ متصل شاراوە »دا دابەش‌کردووەو لەبارەیانەوە دەڵێ :

---

(١) سەعید صدقی ، مختصر صرف‌و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل ٢٨ ـ ٣٣ .

(٢) وەك لە سەرەوە نیشانمدا ، مامۆستا سەعید صدقی باش لە جێناوی کەسیی جودا دواوەو ئەو باسەی دوو لاپەڕەی گرتووەتەوە ، کەچی لیژنەی زمان‌و زانستەکانی کۆڕ کە باسی جێناو لە کتێبی«مختصر صرف‌و نحوی کوردی »دا دەگێڕێتەوە ، دەڵێ : « ١ ـ ضمیری منفصل وەکو من خوێندم، ئەو هەڵستا. مامۆستا سەعید صدقی هەر ئەمەندە لەسەر ڕاناو دواوە » ( ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان‌و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٧ ) .

(٣) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان‌و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٧ .

« ئاشکرا ضمیرێکە لە لفظا شکڵێکی ببێ وەکو ضمیرانێ کە لەم مثالانەدا بە فیعلانو اسمانەوە نووساون ( خوێندم دەرسم ، خوێندت دەرست ، خوێندی دەرسی ، خوێندمان دەرسمان ، خوێندتان دەرستان ، خوێندیان دەرسیان ) • لەم مثالانەدا ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) قسمێکن لە ضمائری متصلە هەم بە فیعلەوە ، هەم بە اسمەوە نووساون • ( یت ، ین ، ێ الف ، ن ) قسمێکی ترن هەر بە فیعلەوە دەنووسێن • وەکو ( دەخۆیت ، دەخۆن ، دەخوا ، دەخۆن ، بخۆن ) •

ضمیر شاراوە – ضمیرێکە لە لفظا شکڵێکی نەبێ • ئەم ضمیرە مخصوص مفرد غائب ماضی لازمو مفرد امرو نەهی حاضرە چە لازم بن چە متعدی . وەکو ( نووست ، دانیشت ، بنوو ، بخوێنە ، مەنوو ، مەنووسە » ( ل ٢٨–٢٩ ) •

مامۆستا سەعید کابان بەدوا ئەمەدا ، ئەوە ڕادەگەیەنێ ، کە ئەو جێناوە لکاوانە بە جێناوی کەسی ناودەبرێنو لە ڕووی بەکارهێنانیانەوە لەگەڵ کرداری تێپەڕو تێنەپەڕی ڕابوردوو جیایان دەکاتەوەو دەڵێ : « ماضی متعدی ئەمانەن : ( م ) بۆ مفرد متکلم ، ( ت ) بۆ مخاطب مفرد ، ( ی ) بۆ غائب مفرد ، ( مان ) بۆ جمع متکلم ، ( تان ) بۆ جمع مخاطب . ( یان ) بۆ جمع غائب ، وەکو ( خوێندم ، خوێندت ، خوێندی . خوێندمان ، خوێندتان ، خوێندیان )• ضمیران شخصیەی ماضی لازم ئەمانەن : ( م ) بۆ مفرد متکلم ، (یت) بۆ مخاطب مفرد ، بۆ مفرد غائب لە فعلەکەدا دەشارێتەوە ، ( ین ) بۆ جمع متکلم ، ( ن ) بۆ جمع مخاطبو غائبە بە قەرینە جوێ دەکرێتەوە ، وەکو ( نووستم ، نووستیت ، نووست ، نووستین ، نووستن ، نووستن » ( ل ٢٩ ) •

لەبارەی ئەو جێناوە لکاوانەشەوە کە دەچنە سەر کرداری ڕانەبوردووی تێنەپەڕو تێپەڕ نووسیویە : « ضمیران شخصیەی حالو

استقبال چە لازم چە متعدی ئەمانەن : ( م ) بۆ مفرد متکلم ، ( یت ) بـۆ مفرد مخاطب • ئەم ( ت )یە دەنووسرێ اما ناخوێنرێتەوە • ( ێ ) بۆ مفرد غائب • لە بعضی فیعلا ( الف ) وەکو ( دەخوا ، دەڕوا ) ، ( ین ) بۆ جمع متکلم ، ( ن ) بۆ جمع مخاطبو غائب بە قەرینە جوێ دەکرێنەوە • مثال بۆ اســـتقبال ، وەکو ( دەخوێنم ، دەنـــووم ، دەخوێنیت ، دەنوویت ، دەخوێنێ ، دەنوێ ، دەخوێنین ، دەنووین ، دەخوێنن ، دەنوون ) • مثال بۆ حال ، وەکو ( وا دەخوێنم ، وا دەنووم ، وا دەخوێنیت ، وا دەنوویت الخ » ( ل ٢٩-٣٠ )•

لە کۆتاییشدا باسی ئەوەی کردووە کە جێناوە لکاوەکان دەبن بـــە کاراو بە بەرکارو بە موزافوئیلەیهی ( ل ٣٠ ـ ٣١ ) •

یەکێ لە ڕووی هەرە دیارو باشـــی ئەم لێدوانەی خاوەنی کتێبی « مختصر صرفو نحوی کوردی » ، ئەوەیە جێناوەکانی کەسی دووەمو سێیەمی تاکی دەستەی دووەم کە تا ئەمڕۆ هەر زمانەوانێك بە شێوەیەك ناوی دەباو لە دیاریکردنیاندا هەڵەی زۆری تێدا دەکرێ ، ئەم ڕاســـتتر بۆیان چووە •

هەروەها شایانی باسە ، مامۆستا سەعید صدقی دەستەی دووەمی وەك جێناو تەماشاکردووە . نەك وەك کۆتایی کردار •

وەك لە سەرەوە وتمان ڕێزمانی عەرەبیو ڕێزمانی فارسی سەرچاوەی مامۆستا کابان بووەو هەر بۆیەش تەنیا باســـی جێناوی کەســـیی جوداو جێناوی کەسیی لکاوی کردووەو هەرچی جۆرەکانی تری جێناوە بە شتی دی داناون • بۆ نموونە ( جێناوی پرســـــیار )ی بە ( ادوات استفهام ) لەقەڵەم داوەو لە لاپەڕە ( ٥١ )دا لە بارەیانەوە نووســـیویێتی : « ادوات استفهام ـ چەند لفظێکن سؤالیان پێدەکرێ • بعضێ لەوان ئەمـانـەن : کێ ، چی ، کەی ، کوا ـ کوێ ، ئاخۆ ـ ئایا ـ ئایاکو ، کام ـ کامەتە ـ

کامەیە ـ کامەیە ، چۆن ـ چلۆن ـ چەن»[٤]. یاخود ئەو وشانەی سەر بە ( جێناوی دیار ) یان ( جێناوی نادیار )ە لە باسی ( ادوات مبهمە )دا لێیان دواوە ( ل ٥٢ـ٥٣ ) ...

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە کتێبی « دەســـتووری زمانی کوردی »دا لەژێر سەرناوی « بۆناو »دا کۆڵیوەتەوە[٥] و جێناوەکانی زمانی کوردی بەسەر حەوت جۆردا دابەش کردووە : « ١ ـ بۆناوی کەسی ســـەربەخۆو پێوەنووســـــاو ؛ ٢ ـ بۆناوی نیشـــــانی ؛ ٣ ـ بۆناوی لێکدەر ؛ ٤ ـ بۆناوی موبهەم ؛ ٥ ـ بۆناوی پرســـــی ؛ ٦ ـ بۆناوی خۆیی ؛ ٧ ـ بۆناوی ملکی ».

نووسەر لـە دیاری کردنی جێنـــاوە کەسی یە جوداکاندا ، جگە لـــە ( من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان ) ، هەروەها ( ئەوە )و ( ئەویّ )یشی بۆ کەسی سێیەمی تاك لەگەڵ ( ئەو )دا ڕیزکردووەو دەربارەیان دەڵێ :

« بۆناوی ( ئەو ) بۆ کەس ، بۆناوی ( ئەوە ) بۆ شـــــت بۆناوی ( ئەویّ ) بۆ جێ بەکەڵك ئەهێنرێ ، وەکو :

**نەخێر ، ئەو ئەمرۆ نایەت .**
**حەیفێ ، ئەوە ئەسپێکی چاك بوو .**
**ئەڵێن ئەویّ زۆر خۆشـــە .**

لەم جوملانەدا ( ئەو ، ئەوە ، ئەویّ ) بۆناوی کەسیی سەربەخۆن » ( ل ٨٤ ).

---

(٤) ئەگەرچی مامۆستا سەعید صدقی ئەو جێناوانەی بە ئامرازی پرسیار داناوە ، بەڵام هەندێ فۆرمی باوو ڕاســـتی وای تۆمارکردووە ، کـــە نووسەرانی تر ناویان نەبردووە .

(٥) تەوفیق وەهبی ، دەســــــــتووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ٨٣ ـ ٨٥ .

وەك ئاشكرايەو وەك مامۆستا وەهبی خۆیشی لە لاپەڕە ( ١٠٢ )دا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ( ئەوە ) و ( ئەوە ) جێناوی نیشانەن •

دوای نیشاندانی جێناوە کەسی‌یە جوداکان ، نووسەر هاتووەتە سەر باسی ئەرکەکانی ئەو جێناوانەو پێنج ئەرکی بۆ دیاری‌کردوون ••• ( ل ٨٤ــ٨٥ ) •

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەژێر سەرباسی « بۆناوی کەسیی پێوەنووساو »دا ( ل ٨٥ــ١٠٢ ) ، ئەگەرچی بە دوورو درێژی لە جێناوە لکاوەکان دواوە ، بەڵام باسەکەی زوربەی زۆری دەربارەی ئەرکەکانی جێناوی لکاوە ، کە سەر بە سینتاکسەو مەبەستی لێکۆڵینەوەی لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوەیە ••• ئەوەی لێرەدا دەمەوێ پەنجەی بۆ ڕابکێشم ، ئەوەیە کە :

١ ــ نووسەری کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » بەپێی ئەرك جێناوە لکاوەکانی دیاری‌کردووەو بە گوێرەی ئەو چوار ئەرکەی لێیان دواوە ، چوار خشتەی داناوە •• ئەمەش بووە بە هۆی پەیدابوونی فۆرمی هەمەچەشن‌و دوورخستنەوەی جێناوەکان لە ئەسڵیان •

٢ ــ مامۆستا وەهبی حەڤدە لاپەڕەی سەبارەت جێناوی کەسیی لکاو نووسیوەو تەنیا نیو لاپەڕەی سەرەتای پێوەندی بە لێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە هەیە ••• بەڵام وەك خۆی پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ، لە باسی گەردانی کرداردا لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لێی دەدوێ ••• دەربارەی ئەو نیو لاپەڕەیە چەند تێبینی‌یەك هەیە :

أ ) جێناوە لکاوەکان بەپێی بەکارهێنانیان جیانەکراونەتەوە ، بەڵکو بە گوێرەی هاتنیان بە دوای دەنگی بزوێن‌و نەبزوێندا ڕیزکراون •

ب ) لە دیاری‌کردنی جێناوە لکاوەکانی کەسیی دووەم‌و سێیەمی تاکدا کەم‌و کورتی زۆرە •

مامۆستا وەهبی لەژێر ناوی « بۆناوی پرسی »دا باسـی ( جێناوی پرسیار )ی کردووەو لە سەرەتادا پێناسەی بۆ داناوەو ئنجا خشـتەیەکی ڕێکخستووە وای تێدا نیشـانداوە کە ( کێ ، چەند ، کام ) بۆ ئینسـانو ( چی ، چەند ، کامە ـ کام ) بۆ شتو ( کوێ ) بۆ جێ بەکاردێن • بەدوا ئەمەشدا باسی ئەرکەکانیانی کردووە ( ل ١١١ـ١١٢ ) •

دوو ناتەواویی بنجی لەم باسەدا دەبینرێ :

١ ـ یادداشت نەکردنی هەندێ جێناوی گرنگو ئاشکرا ، وەك : ( چ ، چۆن ، چلۆن ، کەی ، کوا ، کوانێ ••• ) •

٢ ـ باش دیارینەکردنی مەبەستی بەکارهێنانی بەشـێك لەو جێناوانەی باسی کردوون • بەوێنە وای داناوە ، کە ( کامە ) هەر بۆ شت بەکاردەبرێ ، بەڵام هەڵکەوتی زمانی کوردی نیشانی دەدا کە بۆ ئینسانیش دەبێ •

کەمو کورتی باسـی ( جێناوی خۆیی ) نەك هەر ئەوەیە کە هیچ شتێکی ئەوتۆی لەبارەوە نەوتراوە ، بەڵکو لە دیاریکردنی فۆرمیشیدا هەڵە کراوەو بە ( خـۆم ، خـۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتـان ، خۆیـان ) دانراوە ( ل ١١٢ـ١١٣ ) •

مامۆستا وەهبی بە تەئسیری زمانی ئینگلیزی وای داناوە ، کە لـە زمانی کوردیشدا ( جێناوی لێکدەر ـ Relative Pronoun ) هەیەو ( ی ) و ( کە )ی بۆ ئەم جۆرە دیاریکردووە ••• کەچی بە لای ( جێناوی چەندێتی )دا ( جێناوی نەفی ) و ( جێناوی هاوبەشی )دا نەچووە ، کە لـە زمانی کوردیدا دەوری دیارو ئاشکرا دەگێڕن •

مامۆسـتا نووری عەلی ئەمین لەو کتێبەیدا کە بەناوی « ڕێزمانی کوردی »یەوە بڵاوی کردۆتەوە[٦] لەژێر سەرباسی ( ڕاناو )دا لەو کێشەیە

(٦) نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سـلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٨٧ ـ ١١٠ •

دواوەو ئەمیش وەك مامۆســــتا تۆفیق وەهبی بەســــەر حەوت جۆردا دابەشی‌کردووە : « ١ ـ ڕاناوی کەسی ( جویٚ و لکاو ) ؛ ٢ ـ ڕاناوی خۆیی ؛ ٣ ـ ڕاناوی ئیشــاری ؛ ٤ ـ ڕاناوی گەیەنەر ؛ ٥ ـ ڕاناوی پرسیاری ؛ ٦ ـ ڕاناوی نادیار ؛ ٧ ـ ڕاناوی هەیی »•

نووسەر لە سەرەتادا لە « ڕاناوی کەسیی جویٚ » دواوە و ( من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان )ی دیاری‌کردووەو نموونــەو بەلگەی بۆهێناونەتەوە ( ل ٨٨ـ٨٩ )• دوا بەدوای ئەوەش باســی « ئەرکەکانی ڕاناوی کەسیی جویٚ لە ڕستەدا »ی کردووەو چوار حالەتی دەست‌نیشان کردووە ( ل ٨٩ـ٩٠ ) •

لە لاپەڕە ( ٩٠ ـ ٩٥ )دا لە ( جێناوی کەسیی لکاو )ی کۆلیوەتەوەو بەسەر دوو جۆردا دابەشی کردوون • بۆ جۆری یەکەم « م ، ت ، ی ، مان تان ، یان »ی دیاری‌کردووەو دەلێ چوار ئەرك : « ١ ـ ئەبێتە بکەری هەرچی فرمانــی ڕابوردووی تێپــەڕ هەیــە ؛ ٢ ـ ئەبێتە تەواوکەری سەربەخۆی فرمانی بەهێز ؛ ٣ ـ ئەبێتە تەواوکەری یاریدەدراوی فرمانی بەهێز ؛ ٤ ـ ئەبێتە تەواوکەری ناو ( موزافوئیلەیهی ) » دەبینێ‌و بەلگەو نموونەی بۆ هێناونەتەوە ( ل ٩١ ـ ٩٢ ) ••• دوا بــەدوای ئەوەش باسی جۆری دووەمی کردووە « م » ؛ « ی ( یت ) ، ە » ؛ « یٚ ( یٚت ) ، ت ( ات ) ، • ) ؛ « ین » . « ن » ؛ « ن »ی بۆ دەست‌نیشان کردووەو ئنجا باسی دەورەکانیانی لە ڕستەدا کردووەو لەوە دواوە لەگەڵ کام جۆر کرداردا بەکاردێن‌و لەگەڵ کام بەکارنایەن ( ل ٩٢ـ٩٥ ) ••• ئەم باسە تا ڕادەیەك سەرکەوتووەو کەم‌وســــتەیەکی خراپ نییە ••• کەم‌و کوریی سەرەکیشی ئەوەیە فۆرمی هەندێ جێناو باش دیاری نەکراوە •

نووســــەری ناوبراو لە لاپەڕە ( ١٠١ـ١٠٣ )دا بەناوی « ڕاناوی پرسیاری »یەوە کۆلیوەتەوەو هەشت دەستەی دەست‌نیشان کردووە :

« ١ – کێ
٢ – چۆن ، چلۆن ، کوو
٣ – کام ، کامە
٤ – کەی ، کەنگێ
٥ – کوا ، کوانێ ، کوێ
٦ – ~~چەن ، چەند ،~~ چەنگ
٧ – چی ، چوو ، چما
٨ – ئـایـا » .

ناتەواویی سەرەکیی ئەم باسەش لە دوو ڕووەوەیە :

١ – هەندێ وشـــەی وەك ( ئایا ، چما ... ) لە هیچ ڕوویەکەوە نابنە جێناوی پرسیار .

٢ – یادداشت نەکردنی هەندێ فۆرمی ئاشکرای جێناوی پرسیار ، وەك : چ ، چە ، کوێندەرێ ....

مامۆستا نووری بەهەڵە چووە کە لە باسی ( جێناوی خۆیی )دا دەڵێ : « ڕاناوی خۆیی لە وشەی ( خۆ )و یەکێ لەم ڕاناوە لکاوانە ( م ، مان – ت ، تان – ی ، یان ) پێکهاتووە » ( ل ٩٦ )، چونکە ئەگەر جێناوی خۆیی ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) بوایە ، ئەوە لە شێوەی ( خۆ )دا دەرنەدەکەوت یاخود ( ش/یش )ی پێوەندی نەدەکەوتە نێوان ( خۆ )و جێنـــاوە لکاوەکانـەوە ، یاخود نەدەبوو ( خۆ ) ببێتـــە پارچەیەکی وشەی ناسادە ، بەڵکو دەبوو ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) بن ...

نووسەری کتێبی « ڕێزمانی کوردی »یش هەر وەك مامۆستا تۆفیق وەهبی جۆری ( جێناوی لێکدەر ) کە ئەو ( ڕاناوی گەیەنەر )ی پێ وتووە دیاریکردووە ( ل ٩٩–١٠٠ ) ، بەڵام نـــاوی ( جێنـاوی چەندێتی ) و ( جێناوی نەفی ) و ( جێناوی هاوبەشی ) نەبردووە ...

له باسی جێناوی کتێبی « آوا ئو دەســـــــتورا زمانێ کوردی »ی ماموّستا جگەرخوێن‌دا[7] . باسی چوار جۆر جێناو : ( ١ ـ جێناوی کەسیی جودا ؛ ٢ ـ جێناوی کەسیی لکاو ؛ ٣ ـ جێناوی نیشانە ؛ ٤ ـ جێناوی نادیار ) کراوە (ل ٧١ـ٨٤ ) و هەندێ جێناویش وەك ئامراز تەماشاکراوە (ل ٦٢ـ٦٤ ...) .

نووسەر لە باسی جێناوی کەسیی جودادا ، ئەگەرچی بەپێی سروشتی دیالێکتی ژووروو دوو دەستەی دەستنیشـــــان کردووە ، بەڵام هەڵەو ئاڵۆزیو تێکەڵ‌کردنێکی ئەشارەزایانەی کردووە ( بڕوانە : ل ٧١ـ٧٤ ).. ماموّستا جگەرخوێن ( هوز )ی بە جێناوی کەسیی جودای کەسی دووەمی کۆی دەستەی دووەم داناوە ، بەڵام هەموو بەڵگەیەك ، تەنانەت بەرهەمە ئەدەبیەکانی خۆیشـــــــی ، ئەوە ڕووندەکەنەوە ، کە فۆرمی ( هوون ) سەرەکی‌ترو باوترە لە ( هون ) :

**« ئەم پارسەکن لێ هوون ژ بەخچکا دیبا خوە تێنن »**

**( جگەرخوێن ، ل ٢٥ )**[8]

**« هۆ کەچێن جیهان ! لاوێن سەرگران !**

**ئیـــرۆ هوون جڤین دکـــن مهرجـــان » .**

**( صەبری ، ل ٢٣ )**

یاخود ( وا )ی بە جێناوی کەسیی جودای کەسی سێیەمی کـــــۆی دەستەی یەکەم لەقەڵەم داوە . ڕاستە ناوناوە ئەم فۆرمە دەبینرێ ، بـــەڵام

---

(7) **جگرخوێن ، آوا ئو دەستورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ .**

(8) **لە چەند شوێنێکی کتێبی « جیم‌و گولپەری » ( شـــام ، ١٩٤١ )دا ، ماموّستا جگەرخوێن فۆرمی ( هۆن )ی بەکارهێناوە . وەك :**
**« نابێژن هۆن کەنگێ هاتنە ڤر » ( ل ٢٢ ) .**
**بەڵێ ئەم فۆرمە لە ناوچەیەکی تەسکی کوردەواریدا هەیە ، بەڵام لـــە ئەدەبیاتدا بەدەگمەن بەکارهێنراوە .**

فۆرمی گشتیی باوی ئەو جێناوە لە کرمانجیی ژووروودا ( وان/ئەوان )ەو نەك تێکرای نووسەرانی کرمانجی ژووروو ئەمەیان بەکارهێناوە ، بەڵکو مامۆستا جگەرخوێن خۆیشی هەر ( وان/ئەوان )ی نووسیوەو مەگەر بەدەگمەن ( ەوا )ی نووسیبێ • بەوێنە :

**« ...ل وان مەگرە »**

( جگەرخوێن ، ل ٢٥ )

**« ... من دە یەکە یەکان وان ژ هەڤ ددم بژارتن »**

( جگەرخوێن ، ل ٣١ )

**« ڕەبێ عالەمێ خۆجەیێ خەبەر ل وان کر بەیانە »**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٠ )

**« گۆیا کو ئەوان ژ دەست فەلاتوون**
**خوارن ب یەقین دەواو ماجوون »**

( خانی ، ل ١٧٠ )

لە باسی جێناوی کەسیی لکاویشدا ، دیسان هەڵەو ئاڵۆزیو تێکەڵکردنێکی نەشارەزایانە کراوە ( بڕوانە : ل ٨١-٨٢ )• نووسەر نەك هەر وا دادەنێ کە « م- نیشانا دەنگبێژە • ئی- نیشانا تەکێ پەندیو نەپەندییە • ن - نیشانا هەموو کۆمایە » ( ل ٨١ ) ، بەڵکو بەڵگەو نموونەکانیشی زۆر لاوازو نازانستین •

مامۆستا جگەرخوێن لە باسی « پرسیاری ( الاستفهام ) »دا (ل ٦٢-٩٤ ) وشەکانی ( کێ ، کەی ، کەنگێ ، کا - کوا ، کو ، کیژان - کامە ، بەی ، خوەنە ، خەمۆ ، چە ، چاوا ، چلۆ ، لۆ ، بۆ ، چەند ، چقا ، گەلۆ ، ئایا ، چۆن )ی بەو ئامرازانە داناوە ، کە یارمەتیی پرسیارکردنی ناوێك دەدەن • وەك دیارە نووسەر ئەم وشانەی وەك جێناو تەماشانەکردووە ، جا بۆیە وشەی وەك ( لۆ ، بۆ ، ئایا ، خوەنە ، خەمۆ ...)یان تێکەوتووە ئەگەر ئێمەش وەك ئەو بە ئامرازی پرسیاریان

دابنێین ، ئەوە دەتوانین بڵێین : گەلێ ئامرازی ئاشکرای پرسیاری تریش هەیە ...

لێکۆڵینەوەی هەرە قووڵو زانستیو دیار کە لەبارەی ( جێناو )ەوە نووسراوە ، ئەو لاپەڕانەن ، کە مامۆستا مەسعوود محەمەد لە وتاری « سووڕێکی خامە بە دەوری ڕاناو »دا[٩] ئەو باسەی تێیاندا کردووە •

نووسەر دەربارەی جێناوی کەسیی جودا هەندێ زانیاریی باشی خستۆتە پێش‌چاو ( بڕوانە : ل ٨٦–٩٤ )و بەتایبەتی لەوەی کۆڵیوەتەوە ، کە ئاخۆ ئەو چەند جێناوە هەموویان یەکن‌و یەك توانایان هەیە لە جێگرتنی ناوو بەکارهێنانیان لە ڕستەدا •

مامۆستا مەسعوود لە باسی « جێناوی لکاو »دا لە سێ کێشـەی سەرەکی دواوە :

١ – لە ڕووی زاراوەوە •

بە ڕای واقیعیو نموونەی لەبار ئەوەی ئیسپاتکردووە ، کە چ زاراوەی ( ڕاناو ، جێناو )و چ زاراوەی ( لکاو ) ئێجگار نابەجێن .... ئەگەرچی لە جێی ( لکاو ) وشەی ( چالاك )ی پێشنیار کردووە ، بەڵام ناچار بووە هەر ( لکاو ) بەکاربێنێ (ل ٦٦–٧٥ )•

٢ – ساغ‌کردنەوەی فۆرمی کەسی دووەمی جێناوی لکاوی دەستەی دووەم •

زوربەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بـە هەڵە ( یت ) یان ( ە ) یان ( • ) ... یان بۆ حاڵەتی کەسی دووەمی تاکی دەستەی دووەم داناوە ... ئەو تاکە تاکەیەش کە ڕاستن‌و (ی)یان دەستنیشان کردووە هیچ

---

(٩) مەسعوود محەمەد ، سـووڕێکی خامـە بـە دەوری ( ڕاناو )دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٢ ، ژ ١ ، بەغـدا ، ١٩٧٤ ، ل ٩ – ١٤٧ •

بەڵگەیەکیان نەهێناوەتەوە ••• هەرچی مامۆستا مەسعوود محەمەدە لـــە ساغکردنەوەی ئەم کێشـــەیەدا لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی‌و زمانەوانیی ئەوتۆی کردووە گومان نەمێنێ ، کە فۆرمی ڕاســـتی ئەو دۆخە (ی)یە ( بڕوانە : ل ٨٩_٩٩ )•

٣ _ باسی جێناوەکانی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەم :

أ) ئەوەی چەندین ساڵە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بزوێنی (ە)ی کۆتایی ڕستەی وەك « دارا مەردە »یان بە کرداری « بوون » ( فعـــل الکینونە _ Verb to be ) داناوە ، ئەم ئیسپاتی‌کردووە ، کە ئـــەو بزوێنە جێی جێناوی لکاوی گرتۆتەوەو بۆتە جێناو (ل ١١٠_١٢٩ ) •

ب ) مامۆستا مەسعوود محەمەد ڕاست بۆ ئەوە چووە کە لە حاڵەتی کەسی سێیەمدا هەندێ جار جێناوی لکاو پەیدا نابێ‌و هەروەها باش ئەوەی لێکداوەتەوە کە (ت)ی دوای (ێ)و ( ات )ی وشـــەکانی وەك ( دەچێت ، دەنووسێت ••• دەڕوات ، دەخوات ••• ) زیادەی گەردانی کردارە •

ئەگەرچی هەندێ ســـــــەرنج‌و تێبینیم دەربارەی وتاری ناوبراوی مامۆستا مەسعوود محەمەد هەیە[١٠] ، بەڵام ڕەنگە زێدە ڕۆیی نەبێ ئەگەر بڵێم بەتایبەتی لە باسی جێناوی لکاودا ، ئەوەی مامۆستا مەســــــعوود گەیشتوویەتێ لێکۆڵینەوەیەکی بێ‌هاوتایە ••• بەڵام سەیرو سەمەرە ئەوەیە د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم لەبارەی ئەم وتارەوە دەڵێ : « مامۆستای بەڕێز

---

(١٠) بەتایبەتی لەوەدا کە زاراوەی ( ڕاناو ، جێناو )ی تەنیا لەبەر ڕووناکیی ( جێگری ناو )دا تەماشـــاکردووەو بۆیە هەر جێناوی کەسی ( جوداو لکاو )ی بە جێناو داناوە •

( مەســــعوود محەمەد ـ ئەورەحسان ) هیچ ئەنجامێکی وددەســـــــت نەهێناوە »[11] •

مامۆستا مەسعوود محەمەد هەروەها لە کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی » ( ل ٦ـ٧ ، ٩ـ١٧ ، ٨٥ ٩١ )دا[12] و لـە وتاری « لـە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەك » ( ل ٢٣ ـ ٢٥ )دا[13] و لە « بەسەرداچوونەوە »ی وتاری « لەبارەی هێندێ لە نهێنیەکانی ڕێزمانـی کوردی »ی مامۆستا حەسەنی قزلجی (ل ١٤٦ـ١٤٩ )دا[14] گەلێ زانیاری لەبارەی جێناوە لکاوەکانی زمانی کوردییەوە خستۆتە پێش‌چاو •

مامۆستا حەسەنی قزلجی لە لاپەڕە ( ١٢٤ـ١٢٧ )ی وتاری « لەبارەی هێندێ لە دهێنیەکانی ڕێزمانی کوردی »دا[15] باسی (ت)ی کۆتایی هێندێ کرداری کردووەو لەوەدا لەگەڵ مامۆستا مەسعوود محەمەددا گونجاوە ، کە وتوویە ئەو (ت)انەی کۆتایی کرداری کەسی دووەم‌و ســێیەمی تاك ، وەك : ( دەخۆیت ، دەکەیت ـ دەبات ، دەچێت ...) جێناو نین‌و وشەی

---

(١١) د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگـــەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نوسان‌و پێکەوە نەنووســــانەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٥٣ •

(١٢) مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغـدا ، ١٩٧٦ •

(١٣) مەسعوود محەمەد ، لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەك ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٠ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ١٧ ـ ٢٥ •

(١٤) مەسعوود محەمەد ، بەسەرداچوونەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیــــاری کورد » ، ب٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ١٣٥ ـ ١٧٦ •

(١٥) حەسەنی قزلجی ، لەبارەی هێندێ لە نهێنیەکانی ڕێزمانی کوردی ، « گۆڤـــاری کۆڕی زانـــاری کورد » ، ب٥ ، بەغـــدا ، ١٩٧٧ ، ل ١٣٥ ـ ١٧٦ •

کۆنی دەری‌و ئاوێستای هێناوەتەوە کە لەواندا وەك لە پەهلەویدا ئـەو (ت)انە بەکارهاتوون ...

لیژنەی زمان‌و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد تا ڕادەیەك باش لە جێناوی کەسیی جودا دواوە[١٦] . لە سەرەتادا فۆرمی هەمەچەشنەی ئـەو جێناوانەی تۆمارکردووە ؛ دواتر سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە لـــە دیالێکتی ژووروودا دوو دەستە جێناوی کەسیی جودا هەیە ؛ لە کۆتاییشدا هەندێ لە چۆنیەتی بەکارهێنانیان کۆڵیوەتەوە ... ناتەواویی ئەم باسەی لیژنە لەوەدایە کە چەند جێناوێکی زۆر باوو ئاشـــکرای ناونەبردووە . کەچی هەندێکی ئێجگار کەم بەکارهێنراوی یادداشت کردووە ... لـــە باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی جێناوەکانیشدا هەندێ حاڵەتی چالاك‌و گرنگی لەبیرکردووە .

لیژنەی ناوبراو کە لە کێشەی جێناوی کەسیی لکاو دواوە[١٧] ڕایەکی یەکگرتوو لە نێوان ئەندامەکانیدا نەبووەو بۆیە هەر یەکە بەپێی تێگەیشتن‌و بۆچوونی خۆی بیروڕای تۆمارکردووە :

لە سەرەتادا دەمڕاستی لیژنە ـ مامۆستا مەســـعوود محەمەد ئەوەی ڕاگەیاندووە . کە ئەو بیروڕای خۆی لەبارەی تێکڕای جێناوەکانەوە لـــە وتاری « سووڕێکی خامە بە دەوری ( ڕاناو )دا »دا بڵاوکردۆتەوەو پێویست نییە لێرەدا دووبارەی بکاتەوە (ل ٤٠ ) .

بەدوا ئەمەدا مامۆســـتا نووری عەلی ئەمین لـــە جێناوە لکاوەکانی کۆڵیوەتەوە ( ل ٤٠-٤٣ ) ... ئەگەرچی زانیاریی باشی تۆمارکردووە ، بەڵام هەندێ تێبینیم لەبارەی چەند ڕاو بۆچوونێکیەوە هەیە :

---

(١٦) ڕێـــزمـــانی ئاخـــاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنـــەی زمـــان‌و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٣٤ ــ ٣٧ .

(١٧) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٧ ــ ٥٨ .

ئەم ئەندامەی لیژنە لە سەرەتادا وای دەربڕیوە کـــە لەو بڕوایەدایە (ت)ی کۆتایی کرداری کاتیئێستای کەسی سێیەمی تاکی تێپەڕو تێنەپەڕ ، جێناوی لکاوەو وشەکانی ( دەچێت ، دەخوات )یشی کردووەتە نموونە .. ( ل ٤٠ ) . بەلای منەوە ، نەك هەر ئەو (ت)ە بەڵکو ( یٚ/ آ )ش جێناو نینو زیادەی گەردانین ...

لەو خشتەیەدا کە بۆ دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی سازکردووە، وای نیشانداوە ، کە لە حاڵەتی کەسی ~~سێیەمدا جێناو~~ نییە ( ل ٤١ ) ، کەچی وەك باسمانکرد ، لە سەرەتادا ئەوەی وتووە ، کە « (ت) لە کۆتایی کاری ( مضارع )ی تێپەڕو تێنەپەڕ بۆ کەسی سێیەمی تاك ڕاناوی لکاوە .... » ( ل ٤٠ ) ... دواتریشـــی دەڵێ : « لە ( مضارع )ی تێپەڕو تێنەپەڕی ( معلوم )دا ڕاناوی کەســـی ســـێیەمی تاك لە شـــێوەی ( یٚ ، یت )دا دەردەکەوێت ، وەك : دەچێ . دەچێت » ( ل ٤١ ) ... بەم چەشنە ئـــەمــە لەگەڵ مەبەستی خشتەکەدا یەكناگرنەوە .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین بزوێنی (ە)ی ڕســـــتەی وەك : ( دارا مەردە ) بە جێناوی لکاوی کەسی سێیەم دانانێ[١٨] ، کەچی بزوێنی (ە)ی کرداری فەرمان بۆکەسی دووەمیتاکی بە جێناو لەقەڵەم داوە .

مامۆستا صادق بەهائەدین لە ســـــەرەتادا وای داناوە ، لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا (م) بۆ کەسی یەکەمی تاك ؛ (ی) بۆ کەسی دووەمی تاك ؛ (ە) بۆ کەسی سێیەمی تاك ؛ (ن) بۆ کەسی یەکەمو دووەمو سێیەمی کۆ نیشانە یان پاشگرنو وا ڕادەگەیەنێ کە لەگەڵ ڕەگی کرداری تێنەپەڕو تێپەڕی ڕابوردووو ڕانەبوردوو بەکاردێن ... وێڕای تێکەڵو پێکەڵی ،

(١٨) بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بۆچوونە ، بڕوانە : مەســـــــعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو . ســـــــووڕێکی خامە بـــە دەوری ( ڕاناو )دا ، ل ١١٠ – ١٢٩ .

کەم‌و کورتیی گەورەی ئەم لێدوانە ، بەتایبەتی لەوەدایە ، کە نووسەرەکەی هیچ حیسابی بۆ حاڵەتی دەرکەوتن‌و دەرنەکەوتنی بەرکار نەکردووە •

ئەگەرچی باشە ، مامۆستا صادق ئەوەی خستۆتە پێش‌چاو ، کە لە ناوچەی بادینان لە کەسی یەکەمی کۆدا کۆتایی (ین) لەجێی (ن) دەبینرێ‌و لە کەسی سێیەمی تاکدا (یت) لەبریتی (ە) بەکاردێ ، بەڵام نابێ ئەوە لەبیربکرێ کە چ (یت)و چ (ە) زیادەی گەردانین •••

ئنجا د• نەسرین فەخری کەوتۆتە باسی جێناوی لکاوو لە کەسی سێیەم‌و دووەمی تاك دواوە ( ل ٤٩–٥٠ ) • بەداخەوە ، رام لەگەڵ تێکرای نووسینەکەیدا ناگونجێ :

ئەم نووسەرە وای داناوە کە « (یت) راناوە بۆ کەسی سێیەمی تاك لە کاتی ئێستاو داهاتوودا نەك (ێ) بەتەنیا •••» ( ل ٤٩ )• بۆ ئیسپاتکردنی ئەم رایەشی پێنج بەڵگەی ئەوتۆی هێناوەتەوە ، کە لە رووی زانستی‌یەوە یەك لەیەك کزترن • بەوێنە لە بەڵگەی دووەمدا دەڵێ : « ٢ – لەگەڵ رەگی کاری چاوگ ئەلفیەکاندا کە هەمیشە کۆتاییان بە (ێ) دێت ، ئەگەر (ت)مان قرتاند بڵێین چی ؟ کە هەمیشە کۆتاییان بە (ێ)ی رەگەکەیە یان راناوەکە ؟ ئەگەر بڵێین هی رەگەکەیە ئەی کوا راناو یان بە پێچەوانەوە » ••• « وا بزانم ئەگەر یەکسەر بڵێین راناوە خۆمان لەو هەموو ئاڵۆزی‌و لێکدانەوەو روونکردنەوەیە رزگاردەکەین » ( ل ٤٩–٥٠ )•

ئێمە کە لە زمان دەکۆڵینەوە ، دەچینە بنج‌و بناوانی‌و هەوڵ دەدەین یاساو دەستوورە جۆربەجۆرەکانی بدۆزینەوەو وەك هەن با ناڵەبارو پڕ کێشەو زەحمەتیش بن – بەو چەشنە بیانخەینە پێش‌چاو ••• توێژەر مافی ئەوەی نییە بۆ خاتری ئاسانکردن شتێك بە شتێکی تر لەقەڵەم بدا • چۆن دەکرێ حاڵەتێکی گەردانی کردار بە جێناو دانرێ هەر بۆ ئەوەی خۆمان لە ئاڵۆزی‌و لێکدانەوەو روونکردنەوە رزگاربکەین ! ••• ئەمە لە هیچ

زانستو مەیدانێکدا ، بەتایبەتی لە مەسەلەی زمانەوانیو تێکدانی واقیعی زمانێکدا بە هیچ چەشنێك جێی نابێتەوە •

د• نەسرین لەبارەی جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکیشـــــــەوە نووسیویە : « هەمان شتیش دەڵێین دەربارەی ڕاناوی لکاوی کەســـــی دووەمی تاك » ••• بەڕاستی د• نەسرین دەبوو هیچ نەبێ کەمێ سوود لەو هەموو بەڵگە مێژوویيو واقیعییانەی مامۆستا مەسعوود وەربگرێ •••

لە کۆتاییدا مامۆستا هەژار ڕای خۆی لەبارەی جێناوە لکاوەکانەوە دەربڕیوە ( ل ٥٧–٥٨ )• هەرچەندە ئەم نەچۆتە ناو کێشە ئاڵۆزەکانی ئـەو باســـەوەو بە کورتی لـــە چەند لایەنێکی دواوە ، بەڵام ئـەو زانیارییەی خستوویەتییە پێشچاو لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا دەگونجێ •••

لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕ ، جگە لە باسی جێناوی کەســـــی جوداو جێناوی کەسیی لکاو . هەروەها لەم جۆرە جێناوانەی تریش دواوە : « ڕاناوی لێکدەر » ( ل ٥٨–٦٣ ) ؛ « ڕاناوی خۆیی » ( ل ٦٣–٦٦ ) ؛ « ڕاناوی هەیی » ( ل ٦٦–٦٧ ) ؛ « ڕاناوی پرسیاری » ( ل ٦٨–٧٢ ) ؛ « ڕاناوی نادیار » ( ٧٢–٧٤ ) •

**لەم باسانەشدا جیاوازیی زۆر لەنێوان بۆچوونی ئەندامانی لیژنەدا هەیە • بەوێنە لە باسی جێناوی لێکدەردا بەلای د• نەسرین فەخریو مامۆستا صادق بەهائەدینەوە « تەنها وشەی (کە) ڕاناوە » و « ئەو پیتە (ی)ەی کە هەندێ جار دێتە پێش ڕاناوەکەوە پیتی پەیوەندییەو کەرتی ڕاناوەکە نییـــــــــە ( ل ٥٨ ) ••• مامۆستا نووری عەلی ئەمینیش دەڵێ : « پیتی (ی) یاخود (کە)ئەگەر بە تەنها هاتن هەر یەکەیان ئەو ڕاناوەن کە پێی دەڵێن ڕاناوی لێکدەر ، بەڵام لەم حاڵەتەدا فەرقیان لەگەڵ حاڵەتی بە جووتە هاتنیان لـە ڕستەدا ئەوەیە کە (ی)ی تەنهاو (کە)ی تەنها هەر یەکەیان لەو شێوەیەدا ڕاناوی لێکدەری سادەیە . بەڵام ئەگەر بەسەریەکەوە بەکارهێنران دەبنە**

ڕاناوی ناسادە ( ل ٥٨ ) ••• مامۆستا مەسعوود محەمەدیش ئەمە بە جێناو دانانی‌و بۆ بە جێناو دانەنانی گەلێ نموونەو بەڵگەی زمانەوانیی جوان‌و لەباری هێناوەتەوە ( ل ٥٩ ـ ٦٣ ) •

یاخود لە جێناوی پرسیار دواون ، هەر لە سەرەتاوە مامۆستایان : مەسعوود محەمەدو هەژار بە جێناویان دانەناوە ، بەڵام د• نەسرین‌و مامۆستا نووری‌و مامۆستا صادق بە جێناویان داناوەو هەندێ بەڵگەیان بۆ بۆچوونەکەیان هێناوەتەوە •

مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا[19]، بە شێوەیەکی سادەو ساکار چەند وشەیەکی دەربارەی جێناوی ( من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان )ی نووسیوە ( بڕوانە : ل ١٥٨ ) • بە هەمان شێوەی سادەو ساکار باسی جێناوە لکاوەکانیشی کردووە ( ل ١٥٩ـ١٦٧ )• هەرچەندە دوو دەستە جێناوە لکاوەکانی جیاکردووەتەوە ، بەڵام لە دیاری‌کردنی دەستەی دووەمدا هەڵەو کەم‌و کورتیی زۆر دەبینرێ •

نووسەر لەژێر ناوی « ڕاناوی ئازری »دا لە ( جێناوی هەیی ) دواوە ( ل ١٦٩ـ١٧١ ) • لێرەدا باسی (هی)و (ئی) کردووەو نموونەی زۆری بۆ هێناونەتەوە • ئەم بەشە تا ڕادەیەك سەرکەوتووەو لە بەشەکانی‌تر باشترە •

لەم بەرهەمەدا ، وێڕای ئەو سێ باسە ، باسی جێناوی نیشانەش دەبینرێ ، کە ئەو بە ناوی نیشانەی داناوەو لەژێر سەرباسی ( ناوی نیشانەکردن )دا لێی‌دواوە ( ل ٧٣ـ٨٠ ) •

لە لاپەڕە ( ٥١ـ٥٤ )ی کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا[20] بەناوی « ڕاناوی کەسیی سەربەخۆ »وە کەمێ زانیاری بە شێوازی فێرکردن

---

(١٩) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٠) عەبدوڵڵا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبوو زەید مستەفا سەندی : زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

خراوەتە پێش‌چاو ... لە لاپەڕە ( ٥٥ـ٦٣ )ی کتێبی هەمان پۆلدا باسی « ڕاناوی کەسیی لکاو » کراوە • ڕووی باشی ئەم کارە ئەوەیە ، کە دوو دەستە جێناوی لکاو دیاری‌کراوە ... ئەگەرچی گەلێ هەڵەی تێدایە ، بەڵام سیانیان زۆر دیارن :

١ ـ لە دەستەی دووەمدا بۆ کەسی دووەمی تاك (یت) بە جێناو دانراوەو بۆ کەسی سێیەمی تاکیش ( ات ، ێت ) •

٢ ـ وتراوە : « لەگەڵ فرمانی ڕابوردووی تێنەپەڕدا ، بۆ کەسی سێیەمی تاك ڕاناو نی‌یە » ( ل ٥٦ ) ... بەڵام وەك ئاشکرایە ، **جێناوی** (ە) بە کرداری تێنەپەڕەوە دەلکێ کە لە دۆخی ڕابوردووی نزیکی ئینشائیدا بێ ، وەك : مردووە ، نووستووە ، گەڕاوە ، فڕیوە ...

٣ ـ نووسراوە : « بۆ فرمانی ئێستاو داهاتوو (ات) یان (ێت) بەکاردەهێنین‌و ئەگەر ڕەگی فرمانەکە بە پیتی بزوێن دوایی بێت (ات)و ئەگەر بە پیتی دەنگدار دوایی بێت (ێت) بەکاردەهێنین » ( ل ٥٦ ) .... وەك لێکۆڵینەوە دەری‌دەخا نە (ێت)و (ات) ، نە (ێ)و (ا) جێناو نین‌و زیادەی گەدارنی کردارن ... وێڕای ئەوە ، ڕاست نییە بوترێ ئەگەر ڕەگی کردارەکە بە دەنگی بزوێن دوایی بێت (ات) بەکاردەهێنین ، چونکە وەك پشکنین دەری‌دەخا ئەو (ێ)یە بەدوا بەشێك لە بزوێنەکاندا نابێ بە (ا) ، بەڵکو بزوێنی کۆتایی ڕەگی کردارەکە دەکا بە کۆنسۆنانت‌و خۆی وەك خۆی دەمێنێتەوە ، بەوێنە :

| | |
|---|---|
| **دەنووم** | **دەنووین** |
| **دەنووی** | **دەنوون** |
| **دەنوێ** | **دەنوون** |

دانەرانی کتێبی « زمان‌و ئەدەبی کوردی » لە کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا لە جێناوی نیشانە دواون‌و لەو ڕایەدان لە ڕستەکانی ( ئەم کوڕە ئازایە )و ( ئەو کوڕە ئازایە )دا ـ ( ئەم ... ە ) و ( ئەو ... ە ) ئاوەڵناون‌و

له ڕستەکانی ( ئەمە ئازایە )و ( ئەوە ئازایە )دا ـ ( ئەمە )و ( ئەوە ) جێناوی نیشـــانەن ••• هۆی ئەم هەڵەیە ئەوەیە کـە زاراوەی ( جێناو ، ڕاناو ـ Pronoun )یان تەنیا وەك ( جێگری ناو ) تەماشاکردووە •

له کتێبی پۆلی سێیەمدا ( ل ٣٤ ـ ٣٧ ) بە شـێوەیەکی ساکار لەژێـر سەرناوی « ڕاناوی پرس »دا باسی ( جێناوی پرسیار )یان کردووە ••• له لاپەڕە ( ٢١ـ٢٢ )ی کتێبی پۆلی پێنجەمی ئامادەییشـــدا کە لە جێناوی خۆیی دواون بەهەڵە وایان داناوە ، کە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) جێناوی خۆیین •••

یەکێ لەو کارە دیارانەی لەبارەی جێناوی کەسیی جوداوە نووسراوە، ئەو چەند لاپەڕەیەیە کە د• جەمال نەبەز لە کتێبی « زمانی یەکگرتووی کوردی »دا[٢١] هێناوی‌یەتە بەرهەم ( بڕوانە : ل ٢٣ـ٢٦ )• نووسەر بـە شێوەیەکی ڕاستو زانستی‌یانە دوو دەستە جێناوە کەســـی‌یە جوداکەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروویی دیاری‌کردووەو بە نموونەو بەڵگەی زۆری زمانەوانی بەراوردی کردوونو لـــە چۆنیەتـــی بەکارهێنانیان دواوە ••• سەبارەت بە جێناوە کەسییە جوداکانی دیالێکتی خوارووش کەرەستەیەکی چاکی خستووەتە پێش‌چاو ••• لە کۆتاییشدا بۆ نێزیك‌خستنەوەی هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیو دەوڵەمەندکردنی زمانی ئەدەبی هەنـــــدێ بیروڕاو پێشنیاری پەسەندی خستووەتە ڕوو •

بە بێ سێ‌ودوو دەتوانم بڵێم باشترینو زانستی‌ترین نووسین کە تـا ئێستا بە زمانی کوردی لەبارەی جێناوی کەسیی جوداوە بەرچاوم کەوتبێ ، ئەو چەند لاپەڕەیەی د• جەمال نەبەزە ••• لەو ڕایەدام ئەو چەند تێبینی‌یەش کە ئێستا دەیانخەمە پێش‌چاو لە نرخی ئەو بەرهەمە باشە کەم ناکاتەوە :

د• نەبەز ( هۆن )ی بە جێناوی کەسیی جودای کەسی دووەمی کۆی دۆخی ڕاستەوخۆ ( کە ئەو دۆخی کارای ناوناوە ) داناوە • ئەگەرچی ئەو

---

(٢١) د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .

ڕێژەیە لە ناوچەیەكی تەسكدا هەیە ، بەڵام ئەوە هەر دەمێنێتەوە كە تێكڕای ئەدەبیاتی كرمانجیی ژووروو وا ڕادەگەیەنێ كە ئەو جێناوە (هوون)ە[٢٢]

نووسەر باش لەوە دواوە كە چۆن جێناوەكانی دۆخی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو دەمەكانی كرداری تێنەپەڕدا بەكاردەهێنرێن ، كەچی بە هیچ چەشنێك باسی ئەوەی نەكردووە ، كە ئەو جێناوانە هەروەها لەگەڵ كرداری تێپەڕی دەمی ئێستاو ئایندەشدا دێن .

د. نەبەز ئەگەرچی لە باسی جێناوی كەسیی جودای دیالێكتی خوارووودا گەلێ تایبەتیتی ناوچەی هەولێرو موكریان ...ی باس‌كردووە ، بەڵام بەشێكیانی یادداشت نەكردووە .

... وهەندێكی‌تر .

لە كتێبی « زمانی یەكگرتووی كوردی »دا جگە لە باسی جێناوی كەسیی جودا ، باسی « جێناوی بە كارەوە نووساو » ( ل ٢٦ )و « جێناوی خۆیی » ( ٢٦–٢٧ )یش كراوە . بەڵام ئەم باسانە كەم‌و كورتییان زۆرەو هیچ شتێكی ئەوتۆیان تێدا نییە شایانی باس بێ .

مامۆستا صادق بەهائەدین لەو نووسراوەیدا كە بە ناوی « ڕێزمانا كرمانجی »یەوە نووسیویێتی‌و بە ڕۆنیۆ ڕاكێشراوە[٢٣] لە لاپەڕە ( ٨٤–٩٦ )دا لە جێناوی كەسیی جودا دواوە . ئەگەرچی نووسەر لەم كارەدا دوو دەستە جێناوی كەسیی جودای دیاری‌كردووەو كەرەستەیەكی زۆری لەبارەی كێشەی ناوبراوەوە خستووەتە پێش‌چاو ، بەڵام لە گەلێ شوێندا تەواو لە باسە بنەڕەتییەكە دووركەوتووەتەوەو گەلێك شتی هەمەجۆری تێكەڵ بەیەكتر كردووە ...

---

(٢٢) بۆ شی‌كردنەوەو لێكدانەوەی ئەو ڕایە ، بڕوانە : لاپەڕە ( ٢٧ ، ٨٠ )و پەراوێزی ( ٨ ) .

(٢٣) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا كرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

سەرنجڕاکێش ، ئەوەشە مامۆستا صادق فۆرمی هەندێ جێناوی بە چەشنێك دیاری‌کردووە ، کەچی کاتێ بەکاری دێنێ فۆرمێکی دی دەنووسێ • بەوێنە بۆ کەسی سێیەمی کۆی دەستەی دووەم (وا)ی داناوە ، بەڵام لە سەرپاکی نووسینەکەیدا کە دەدوێ (وان)ی بەکارهێناوە •

نووسەر ئەگەرچی باسی جێناوە لکاوەکانی تێکەڵ بە جێناوی جوداو گەردانی کردن کردووە ، بەڵام کەرەستەیەکی زۆری لەبارەی کێشەی ناوبراوەوە خستۆتە پێش‌چاو و لە دیاری‌کردنی فۆرمیاندا تا ڕادەیەك سەرکەوتووە •

مامۆستا صادق لە لاپەڕە ( ٩٦-٩٧ )دا لە ( جێناوی هەیی ) دواوەو لێرەدا ئەوەی دەست‌نیشان کردووە کە جێناوی هەیی لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە پێی جنسی نێرو مێ دەگۆڕێ‌و ( ئی ، یێ ) بۆ نێر بەکاردێ‌و ( یا ، ئا )ش بۆ مێ ••• هەڵەی ئەم باسە ئەوەیە ، کە نووسەر جێناوی هەیی‌و نیشانەی ئیزافەی تێکەڵ‌کردووە • هەرچی (یێ)و (یا)یە ڕاستە جێناوی هەیین ، بەڵام (ئی)و (ئا) کە ڕاستی‌یەکەی (ێ)و (ا)ن نیشانەی ئیزافەن •

نووسەر لە لاپەڕە ( ١٠٨-١٠٩ )دا ، کاتێ باسی ( جێناوی پرسیار )ی کردووە ، وێڕای ئەوەی ناوی بەشێکی زۆری ئەو جێناوانەی نەبردووە ، هەروەها جارێك بە جێناو ناویان دەباو جارێکیش بە ئامراز •

ئەگەرچی مامۆستا محەمەد مەعرووف فەتتاح لە وتاری « خۆیەتی لە زاری سلێمانیدا »دا[٢٤] مەبەستی سەرەکی دیاری‌کردنی شێوەی جیاوازی دەربڕینی خۆیەتی لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدایە ، بەڵام بەتایبەتی لەبارەی

---

(٢٤) محەمەد مەعرووف فەتاح ، ( خۆیەتی ) لە زاری سلێمانیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد » ، ب٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٦٢ - ١٦٥ •

جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەمەوە گەلێ زانیاری تۆمارکردووە ، چونکە ئەم دەستەیە دەورێکی گەورە لە دەربڕینی خۆیەتیدا دەبینێ ... هەروەها جێناوەکانی دەستەی دووەمیشـــی دیاری‌کردووەو کەمێك لێیان دواوە . ئەوەی جێی ڕەخنە بێ ، ئەوەیە (ت)ی بۆ کەسی دووەمی تاکو ( ێ ، ێت ، ئا ، ئات )ی بۆ کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەم بە جێناو داناوە .

د. کوردستان موکریانی لە وتاری « جۆرەکانی جێناوو دەوریان لـە ڕســـــتەی کوردیـــدا لـــە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و کرمانجیی ژووروودا»دا[٢٥] دە جـــۆر جێنـــاوی دیاری‌کردووە : « ١ - جێناوی کەسی » ( ل ٢٣٤-٢٣٩ ) ؛ ٢ - جێناوی لکاو » ( ل ٢٤٠-٢٤٢ ) ؛ « ٣ - جێناوی نیشانە » ( ل ٢٤٢-٢٤٤ ) ؛ « ٤ - جێناوی پرسیاری » ( ل ٢٤٤-٢٤٧ ) ؛ « ٥ - جێناوی چەندی ( چەندێتی ) » ( ٢٤٧-٢٤٨ ) ؛ « ٦ - جێناوی هەیی » ( ل ٢٤٨-٢٤٩ ) ؛ « ٧ - جێناوی خۆیی » ( ل ٢٤٩-٢٥٠ ) ؛ « ٨ - جێنـــاوی نـــادیـــار » ( ل ٢٥٠-٢٥١ ) ؛ « ٩ - جێناوی دیار » ( ل ٢٥١-٢٥٢ ) ؛ « ١٠ - جێناوی نا ( نەفی ) » ( ل ٢٥٢-٢٥٣ ).

نووسەر بە کورتی لە جێناوی لکاو ( بەتایبەتی دەستەی یەکەم ) و دەوری لە ڕستەدا دواوە ... هۆی باس‌نەکردنی دەستەی دووەمـــــی جێناوەکان ئەوەیە ، کە بە جێناویان دانانێ‌و لەم بارەیەوە نووســـــیوێتی دەڵێ : « هێندێ لە زمانەوانان گرووپی دووەم بە جێناوی لکاوو لـــــە هەمان‌کاتدا بە کۆتایی کەسی دەدەنە قەڵەم ... وەیا بە کاری بێ‌هێز ،کاری یارمەتی‌دەر یان پێوەندی کـاری دەژمێرن . جێناوە لکاوەکانی گرووپی

(٢٥) د. کوردستان موکریانی ، جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕســـــتەی کوردیدا لە دیالێکتی کرمـــانجیی خوارۆو و کرمـــانجی ژووروودا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد » ، ب٧ ، بەغـدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٢٩ - ٢٥٤ .

دووەم جێناوی لکاو نین ، هەروەها گاریش نین ، بەڵکو ئەو کۆتاییانەن ، کە بە کۆتایی کـــاری ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕ وە کاری ڕابوردووی تێنەپەڕەوە دەلکێن • لە ڕســـــتەدا ئەو دەورە ناگێڕن کە ڕاناوی لکاو ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) دەیگێڕن و دەبنە بەرکاری ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆو دیارخەر • ئەرکی گرووپی دووەم ( م ، ی ، ێ ، • ، آ ، ین ، ن ، ن ) تەنیا نیشاندانی کەس‌و ژمارەیە ، نەك گێڕانی دەوری کار • ئـەم کۆتـاییـانـە ، کـە لەبەر ئەرکی ڕێزمـانیی ئێـوی ( کۆتایی کەسی ) لێنراوە » ( ل ٢٤٠ ) •

وا دەردەکەوێ د• کوردستان لەو ڕایەی پەشیمان بوو بێتەوە ، بۆیە لەو کتێبی ڕێزمانەدا ، کە لەگەڵ د• نەســـرین فەخرێ‌دا بۆ بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەددین دایاننا‌وە ، تێکڕای ئەو پاشکۆیانەی وەك جێنـــاو باس‌کردووە[٢٦] •

بەڵێ هەندێ نووسەرانی دی ڕێزمانی کوردی باسی ئەم دەستەیەیان هەر لە بەشی گەردانی کرداردا کردووەو بە کۆتایی کرداریان لەقەڵەم داوە ( دواتر لێیان دەدوێین ) •

ناتەواویی د• کوردستان لە باسی جێناوی پرسیاردا ، ئەوەیە هەندێ جێناو یان فۆرمی‌هەندێ جێناوی یادداشت نەکردووە ، بە وێنە :

١ ـ یادداشت نەکردنی جێناو • وەك :

کەی / کەنگێ / کەنگی •••

---

(٢٦) د. نەسرین فەخری‌و د. کوردستان موکریانی ، ڕێزمانی کوردی بــۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی ســـــەلاحەددین ، ١٩٨٢ ، ل ٦٨ و ٧٢ ـ ٧٤ .

لەم کتێبەشدا ، هەروەك لە وتاری « جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕســــتەی کوردیدا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا »دا دە جۆر جێناو دیاری‌کراوە ( بڕوانە : ل ٥٩ ) .

کوا / کوانێ / کا / کانێ ...
کوێ / کوێندەرێ / کیرێ / کیدەرێ ...
٢ ـ یادداشت نەکردنی فۆرمی جێناو . وەك :

( کێها )ی نوسیوەو ( کێهە )ی نەنووسیوە .
( چۆن )ی تۆمارکردووەو ناوی (چلۆن)و (کوو)ی نەبردووە .
« چەوا (ن) »ی یادداشتکردووەو « چاوا (ن) »ی یادداشت نەکردووە .

نووسەر لە باسی جێناوی چەندێتیدا بۆ ئەوانەی کرمانجیی خواروو تەنیا ( چەند ، ئەوەندە ، هێندە )ی نووسیوە . بۆ ئەوانی کرمانجیی ژووروش هەر باسی ( چەند ، چقاس ، ئەڤقاس ، ئەوقاس )ی کردووە .

دە کوردستانیش وەك مامۆستا تۆفیق وەهبیو مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە دیاریکردنی فۆرمی جێناوی خۆییدا بەهەڵە چووەو هەروەها ( جێناوی هاوبەشی )ی باس نەکردووە ...

ئەگەرچی ئەو ناتەواوییانەو هەندێکی تر لە وتاری ناوبراودا دەبینرێن ، بەلام دەبێ ئەو ڕاستییەش فەرامۆش نەکرێ ، کە .

دە کوردستان تا ڕادەیەك کەرەستەی باشو ڕای زانستیو نوێی خستۆتە پێشچاو .

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە دوا بەرهەمی زمانەوانیدا ـ « زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا »[٢٧] تا ڕادەیەك باش لە جێناوە کەسییە جوداکانی بەشە دیالێکتی هەورامانی دواوەو هەروەها نموونەی ڕاستو لەبارِی لە قوولایی ئەدەبی ئەو ناوچەیەوە هەڵهێنجاوەو کردوویەتییە بەڵگەی قسەکانی ( بڕوانە : ل ١٨٩-١٩٠ ؛ ٢٦٤-٢٦٥ ) .

---

(٢٧) محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا بەغدا ، ١٩٨١ .

نووســـەر لـــە باسی جێنـاوی لـکاودا ( ل ١٨٦ – ١٨٩ ) ئەوەی دیاری کردووە . کە لە بەشە دیالێکتی ناوبراودا (م) بۆ کەسی یەکەمی تاك ؛ (ت) بۆ کەسی دووەمی تاك ؛ (ش) بۆ کەسی سێیەمی تاك ؛ (ما) بۆ کەســی یەکەمی کۆ (تا) بۆ کەسی دووەمی کۆ ؛ (شا) بۆ کەســـی ســـێیەمی کۆ جێناوی لکاون‌و دەچنە سەر چاوگ‌و ئاوەڵناو •

یەکێك لەو نووسەرانەی باسی دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانیان لە بەشـــی گەردانی کرداردا کردووەو بـــە کۆتایی کرداریان لەقەڵەم داوە د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیمە • ئەوەتە لە وتاری « گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوەنووسان‌و پێکەوە نەنووسانەوە »(٢٨) دەڵێ : « بـــەڵام لێکۆڵینەوەی ئێمە دەری‌دەخات ، کـــە وێنەی دووەم ( م ، ت ، ی/یت ، • ، ین ، ن ، ن ) ڕاناو نین‌و نابێ ناویان لێ‌بندرێت ڕاناو • دەتوانم ئەم ڕایەش دەربڕم لەبەر هەبوونی تیشکی ئەم ڕاستییانەی خوارەوە :

١ – ئەمانە ، کە ناویان براوە ڕاناو ڕاناو نین ناتوانن ببن بە بەشێك لە بەشەکانی ڕستە •

٢ – بە هیچ جۆر شوێنی خۆیان ناگۆڕن لەناو ڕستەدا •

٣ – هەردەم بە کۆتایی فەرمانەوە دەلکێن‌و خۆیان لە کۆتایی فرمان جیاناکەنەوە •

٤ – فۆرمی ( سفر ) چۆن دەتوانن ببن بە ڕاناو ؟

لەبەر ئەم چوار خاڵانەی سەرەوە ناتوانین جۆری دووەم بە ڕاناوی لکاو دابنێین ، بەڵکو ئەمانە کۆتایی فرمان‌و دەکەونە کۆتایی فرمانەکان » ( ل ٤٥٣–٤٥٤ ) •

---

(٢٨) د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، گیروگرفتی نووسینی فرمـان لەگـەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوەنووسان‌و پێکەوە نەنووســـــانەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق – دەستەی کورد » ، ب٩ ، بەغـــدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٥٠ – ٤٨٢ •

هەندێ بەشە ئاخاوتن هەن نابن بە بەشێك لە بەشەكانی ڕستەو بەشە ئاخاوتنیش هەر بە ڕێبازی بوونە بەشی ڕستە جیاناكرێتەوە ... جا ئەگەرچی لە سەرێكەوە یەكەم بەڵگە كە د. ئیبراهیم بۆ دەستەی دووەم لە جێناوخستن هێناویەتی‌یەوە زۆر بەجێ نییە ؛ لە سەرێكی تریشەوە تووشی هەڵەیەكی بنەڕەتی بووە . ئەویش ئەوەیە بەر لەهەر شت ئاشكرا دیارە كە دەوری كاراو بەركار دەبینن لە ڕستەدا ، وەك :

أ ـ دەوری كارا :

**دەمان‌نێرن ـ ئەوان ئێمە دەنێرن**

**دەت‌گرین ـ ئێمە تـۆ دەگرین**

ب ـ دەوری بەركار :

**ناردمـانن ـ ئێمە ئەوانمان نارد**

**گرتیـانین ـ ئەوان ئێمەیان گرت**

بەڵگەی دووەم هێندە لاوازە ، كە قووڵ‌بوونەوە لە وەڵامیدا بـە پێویست نازانم‌و تەنیا ئەوەندە لە توێژەر دەپرسم : لە كەیەوە مەسەلەی شوێن گۆڕین لە ڕستەدا بووەتە مەرجی پێناسەی جێناو ؟ .

**بەڵگەی سێیەم ، كە دا دادەنێ « هەردەم بە كۆتایی فرمانەوە دەلكێن‌و خۆیان لە كۆتایی فرمان جیاناكەنەوە » ، ئەگەرچی مەرجێكی نابـەجێیە ،** هەروەها ڕاستیش نییە ، چونكە وەك ئاشكرایە ، جێناوەكانی دەسـتەی دووەم بە زۆر بەشە ئاخاوتنی تریشەوە دەلكێن ، بەوێنە :

١ ـ دەچێتە سەر ناو . وەك :

**من شێرزادم ، ئێمە شێرزادو شیروانین**

**تـۆ كوردی ، ئەوان كوردن**

٢ ـ بە ئاوەڵناوەوە دەلكێ . وەك :

**تـۆ جوانی ، ئەوان جوانن**

**من زیرەكم ، ئێمە زیرەكین**

٣ ــ لەگەڵ زوربەی جێناوەکاندا دێ :

أ) لەگەڵ جێناوی کەسیی جودا • وەك :

**منم ، ئێمەین ، ئێوەن ••••**

ب) لەگەڵ جێناوی پرسیار • وەك :

**من کێم ، ئێمە کێین ، ئەوان کێن •••**

ج) لەگەڵ جێناوی خۆیی • وەك :

**ئێمە خۆین ، ئێوە خۆن •••**

د) لەگەڵ جێناوی نەفی • وەك :

**تــۆ هیچی ، ئێوە هیچن •••**

**••• و هەندێکیتر •**

٤ ــ دەچێتە ســـــەر چەند جۆرێك لــــە ئاوەڵکردار ( بەتایبەتی ئاوەڵکرداری شوێن ) • وەك :

**من لێرەم ، ئێمە لێرەین •••**

**من لە سەرەوەم ، ئێمە لە سەرەوەین •••**

٥ ــ بە ژمارەوە دەنووسێ • وەك :

**ئێمە چوارین ، ئەوان شەشن •••**

**••• و گەلێکیتر •**

بەڵگەی چوارەمیشی زۆر کزو لاوازە • چونکە ئاشکرایە لە زماندا جێناوی نادیار ( شاراوە ) هەیەو تەنانەت مامۆستا ســـەعید صدقی کابان لەمە دواوە •

**د• ئیبراهیم دوای ئەو چوار بەڵگەیەی لە ڕێیانەوە ویســـتوویەتی** دەستەی دووەمی پێ لە جێناوەتی بخا ، وا دەردەبڕێ کە تەنیا (ێ) جێناوەو دەڵێ : « لە نـــاو فۆرمەکانی ( م ، ت ، ی/یت ، • ، ین ، ن ، ن )

ڕاناوی (یٚ) هەیە لە لای هەندێ نووسەرانی ڕێزمانی کوردییەوە ، کە بە ڕای ئێمە کۆتایی فرمانن ، بەڵام ئێمە سەبارەت (یٚ) دەڵێین ئەم فۆرمە ڕاناوی لکاوە چونکە دەتوانێ بە ناو بلکێ لە ڕستەدا یان بە ڕاناوی کەسی لکاو هەروەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دیارە » ( ل ٤٥٤ )٠

وەك ئاشکرایە ، لە مێژە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە یەکێتی سۆڤیێت مامەڵەی جێناوی لکاویان لەگەڵ (یٚ)دا کردووە ... ئەم بۆچوونە جێی سەرنجو تێبینی زۆرەو ئێرە جێی لێدوانی نییە ؛ بەڵام ئەوەندەی پێوەندی بە باسەکەی دە ئیبراهیمەوە هەبێ ، سەرسووڕهاوەر ئەوەیە ، زوربەی ئەو بەڵگانەی ئەو بۆ بە جێناو دانانی (یٚ) هێناونی‌یەوە نادروستو هەڵەن :

ڕستەی « دوێنێ زوو گەیشتمە هەولێرێ »و ... کە بۆ ئەوە کردوویەتیە نموونە ، گوایا ئەو جێناوە چووەتە سەر ناو (یٚ)ی دوای وشەی ( هەولێر ) جێناوی کەسی سێیەمی تاکە ـ هەڵەیەکی گەورەی زمانەوانییە ، چونکە ئەو (یٚ)یە نیشانەی جنسی مێیە ؛ لە هەندێ بەشە دیالێکتی وەك سۆرانو موکریان ... دا[٢٩] ٠ لەبەر ئەوەی نیشانەی جنسی مێ لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا نەماوە ، ئەو ڕستەیە دەبێتە : « دوێنێ زوو گەیشتمە هەولێر » ٠

دیسان کە دەڵێ : ڕاناوی ناوبراو دەتوانێ ببێ بە ئاوەڵکاری شوێن لە ڕستەدا ، نموونە :

★ مارەکەی خۆ خشاندە کونێ ٠

★ نوێنەرەکان ڕۆیشتنە کەرکووکێ ٠

---

(٢٩) بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ـ مۆرفۆلۆژی ، بەشی یەکەم ـ ناو ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٧٢ ـ ١٧٨ ٠

★ گەشـــتکەرەکان هاتنە دهۆکێ » ، ئەوە لەمانەشـــدا هەمان هەڵەی کردووەو (ێ)ی دوای وشـــەکانی ( کون ، کەرکووك ، دهۆك ) دیسان نیشانەی جنسیمێیە • ئەگەر بە شێوەی سـلێمانی ئەو ڕســـتانە بووترێن • ئەوە لە ڕستەی بەکەمدا پاشبەندی (ەوە) دەچێتە سەر وشەی ( کون )و بەو پێیە بە قسەی د• ئیبراهیم بێ ، دەبێ (ەوە)ش جێناو بێ••• یاخود لە ڕستەی دووەم‌و سێیەمدا هیچ شتێك ناچێتە سەر ( کەرکووك )و ( دهۆك ) ، کەچی نووسەر پێشتر لە بەڵگەی چوارەمی دانەنانی دەستەی دووەمی ئەو پاشـــبەندانەدا بە جێناو وتویە : « فۆرمی ( ســـفر ) چۆن دەتوانێ ببێ بە ڕاناو »•

نامەوێ لە تێکڕای نموونەکانی بدوێم ، تەنیـــا پەنجە بۆ خاڵێکی سەرنجڕاکیش درێژدەکەم ، ئەویش ئەوەیە کە بەڵگەی ســـەرەکی دانانی (ێ) بە جێناوی لکاو ، ئەوەیە کە دەڵێ : دەلکێ « بـە ڕانـاوی کـەسـی لـکاو »ەوەو « ناردمێ ، ناردنێ ، ناردێ ، نـاردمانێ ، نـاردتـانێ ، ناردیانێ »ی بە نموونەهێناوەتەوە ••• ئەمە ڕاســـتە ، بەڵام خۆ تێکڕای جێناوە لکاوەکانی دەستەی دووەم ، کە د• ئیبراهیم بە کۆتایی کرداریان دادەنێ • ئەوانیش بە جێناوی کەسیی لکاوەوە دەلکێن ، وەك : ( ناردیانم ، ناردیانی • ناردیانین ، ناردیانن ••• ) • کەواتە بۆ ئەمان جێناو نەبن‌و (ێ) جێناو بێ •

د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم کاتێ لە باسی ئەوەدا ، کە دەســـتەی دووەمی جێناوەکانی بە کۆتایی کردار داناوە ، لەبارەی وتاری « سووڕێکی خامە بە دەوری ( ڕاناو )دا »وەی مامۆســـتا مەســـعوود محەمەد دواوەو وتوویە : مامۆستا مەسعوود « ئەوەی پێکاوە ، کە کێشە لەسەر جۆری دووەمی ڕاناوی لکاو هەیەو دەڵێ هەندێ لـــە زمانەوانان بە ( کار )ی دادەنێن‌و هەندێکی تریش بە ڕاناو ، بەڵام مامۆستای بەڕێز هیچ ئەنجامێکی وەدەست نەهێناوە » ( ل ٤٥٣ ) ••• ئاشکرا دیارە ، د• ئیبراهیم لـــە

نووسینەکەی مامۆستا مەسعوود محەمەد نەگەیشتووەو وێڕای ئەوەشـــــس حوکمێکی نارەوای داوە •••

مامۆستا مەسعوود لە وتاری ناوبراودا دوای ئەوە نەکەوتووە ، کـــە دەستەی دووەم جێناون یان کۆتایی کردار ، بەڵکو هەوڵی داوە ، هەڵەی نووسەران لە دیاریکردنی جێناوی کەسی دووەم‌و سێیەمی تاکی دەستەی دووەم دووربخاتەوەو فۆرمی ڕاستی ئەو جێناوانە دەست‌نیشان بکات •• هەروەها بزوێنی (ە)ی کۆتایی ڕستەی وەك ( دارا مەردە ) ، کە زوربەی زمانەوانان بە کرداری دادەنێن ، ئەو ئیســــــــپاتی‌کردووە ، کە جێناوی لکاوە ••• بەو پێیە ، ئاشکرا دیارە ، کە مامۆستا مەسعوود ئەو پاشبەندانە بە جێناو دادەنێ ، نەك بە کۆتایی کردار ••• هەرچی مەســــــــــــەلەی وەدەست‌هێنانی ئەنجامە ، ڕەنگە زێدە ڕۆیی نەبێ ، ئەگەر بڵێم لە باســـی جێناوی لکاودا ، ئەوەی مامۆستا مەسعوود گەیشتوویەتێ ـ ئەگەرچی لە هەندێ شوێنیشدا ڕام لەگەڵی ناگونجێ ـ لێکۆڵینەوەیەکی بێ‌هاوتایە •

د• بەدرخان سندی لە بەرگی دەیەمـــی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەســــــتەی کورد »دا وتارێکی بەناوی « ( ئەز ) ئو ( من ) د ئەزمانێ کوردیدا »دا بڵاوکردووەتەوە[٣٠] و تێیدا باســــــــی جێناوی کەسیی جودای لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا کردووە ••• بێ‌گومان باشە ، کە نووسەر دوو دەستە جێناوی کەسیی دەست‌نیشـــــان کردووەو دەستووری بەکارهێنانی هەر کۆمەڵێکیانی بە دوورو درێژی باس‌کردووە ، بەڵام بەداخەوە وتارەکەی لە زۆر ڕووەوە ڕەخنەی لێ‌هەڵدەستێ • بەوێنە :

★ مەسەلەی دیاریکردنی دوو دەســـــتە جێناوی کەسیی جودا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، نەك‌هەر بە زمانی بێگانە ، بەڵکو دەمێکە

---

(٣٠) د. بەدرخان ســــــــندی ، ( ئەز ) ئو ( من ) د ئەزمـــانێ کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەســــــــتەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ١٣٣ ـ ١٥٣ .

بە زمانی‌کوردی‌یش لە لایەن د. قەناتی کوردۆو مامۆستا جگەرخوێن‌و د. جەمال نەبەزو مامۆستا صادق بەهائەدین ... ەوە باس‌کراوە ، کەچی د. بەدرخان هیچ ناوی ئەوانە نابا‌و لە وتارەکەیدا پەنجە بۆ هیچ سەرچاوەیەك ڕاناکێشێ ...

★ زانایان‌و ئەدەب‌و فۆلکلۆری دیالێکتی ژووروو و ئاخاوتنی مەڵبەندە جیاوازەکانی سەر بە دیالێکتی ژووروو ، ئەوە ئیسپات‌دەکەن کە دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە ئەمانەن : « ئەز ، تو ، ئەو ، ئەم ، هوون ، ئەو (ان) ». کەچی د. بەدرخان بە « ئەز ، تو ، ئەو ، ئەم ، هین ، ئەو[31] »ی لەقەڵەم داون . لێرەدا دوو تێبینی دەخەمە پێش‌چاو :

١ ـ زوربەی هەرە زۆری سەرچاوەکان ئەوە دەگەیەنن کە فۆرمی باوی کەسی دووەمی کۆی جێناوی کەسیی جودا لە کرمانجیی ژووروودا ( هوون )ە ، بەڵام د. بەدرخان ( هین )ی تۆمارکردووە[32]... من بەش بە حاڵی خۆم فۆرمی ( هین )م تەنیا لە کارەکەی مامۆستا صادق بەهائەدین‌دا دیوەو لە نەخشەکەی د. مەکسیمی خەمۆدا لە شێوەی بامەڕنی‌دا بەرچاوم کەوتووەو لە چەند کەسێکی کەمی ناوچەی بادینانم بیستووە .

٢ ـ ڕاستە بۆ کەسی سێیەمی کۆی کۆمەڵی یەکەم ( ئەو ) زۆر لە کاردایە . بەڵام ( ئەوان )یش هەیەو نووسەر ناوی نەبردووە .

---

(٣١) د. بەدرخان ئەو جێناوانەی باش ڕیزنەکردووە . ڕیزکردنەکەی بەم جۆرەیە : ( ئەز ، تو ، هین ، ئەو ، ئەو ، ئەم ) ـ واتە : کەسی یەکەمی تاك ، کەسی دووەمی تاك ، کەسی دووەمی کۆ ؛ کەسی سێیەمی تاك ، کەسی سێیەمی کۆ ، کەسی یەکەمی کۆ .

(٣٢) ئەم فۆرمی ( هین )ە ، وەك د. مەکسیمی خەمۆ نیشانی‌داوە ، لە ناوچەی بامەڕنی بەکاردێنرێ . ( بڕوانە : د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عیراق ، کتێبی « وڵاتان‌و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك‌و ناوەڕاست » ، ب٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٣١ – ٣٣٢ ) .

د. بەدرخان بۆ کەسی دووەمی کۆی جێناوی کەسیی جودای دەستەی دووەم ( هەوە )ی نووسیوە . بەڵام هەموو بەڵگەیەك ئەوە دەگەیەنێ ، کە ئەم فۆرمە تەنها لە ناوچەیەکی تەســـکی بادینانادا بەکاردێ[٣٣]و ، فۆرمی ئاشکراو گشتیی ئەو جێناوە (وە)یە .

★ نووسەر وا ڕادەگەیەنێ کە هەندێ لە شاعیرانی کلاسیکی وەك نالیو وەفاییو کوردی ... فۆرمی ( ئەز )یان بەکارهێناوە ( بڕوانە : ل ١٣٥ ) ، بەڵام تاکە نموونەیەك چییە نەیهێناوەتەوە .

★ د. بەدرخان کە لە باسی دەســـتووری بەکارهێنانی جێناوەکاندا شازدە حاڵەتی دەستنیشان کردووە ، زۆر جار هەر دەستوورێکەو بەسەر دوان یان سیاندا دابەشی‌کردووە . بە وێنە خاڵی سێیەم کە لە جێناوی(من)و هەڤاڵەکانی دەدوێ لەگەڵ دەمی ئێســـتای کرداری تێپەڕداو خاڵی چوارەم کە باسی هەمـان جێناوی ( من )و هەڤاڵەکانی دەکات لەگەڵ هەمان جۆرە کرداری تێپەڕدا لە کاتی ئایندەدا ، باشــــــترە جیانەکرێنەوەو بەیەك بەند بنووسرێن .

★ وتاری ناوبراو کاتێ شێوازی زانســـتی تەواوی وەردەگرت کە نموونەو بەڵگەی لە بەرهەمی ئەدیبانـــی کوردی وەك : خانیو جزیریو صەبری ...و تێکستی فۆلکلۆری بەناوبانگی وەك : مەمی ئالان ... و هەندێکی ترەوە وەربگرتایە .

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێ ، ئەو ڕاستییە لەبیر نەکەین ، کـــە د. بەدرخان ئەگەرچی زمانەوانیش نییە ، بەڵام کارەکەی لە کاری هەندێ زمانەوان قووڵترو زانستییانەترە .

---

(٣٣) لە ناوچەی ( باوەجانی )یش لە کوردستانی ئێران ( هەوە ) لەجیـــاتیی ( ئێوە )و ( هەمە ) لەجیاتیی ( ئێمە ) بەکاردێنن .

وتاری « لایەنێکی جیاوازی » ، نووسەرەکەی د• وریا عومەر ئەمین[٣٤] ، بەشێکی کەمی دەربارەی جێناوی کەسیی جودایە • باشیی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەتایبەتی لەوەدایە ، کە لەسەر شێوازێکی زانستیی نوێ نووسراوە ، بەلام بە گشتی باسێکی قووڵ نییەو کەرەستەی زمانی کوردی کەمتێدایەو ناتەواوی زۆرە •

د• وریا لە نەخشەی ژمارە ٣دا ( بڕوانە : ل ٢٦١ )و لە سەرپاکی نووسینەکەیدا لە دەستەی B ی جێناوی کەسیی جودا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بۆ کەسی دووەمی کۆ ( هون )ی نووسیوە • وەك پێشتر لێی دوام[٣٥]و دواتریش باسم کردووە[٣٦] ، ( هوون ) پتر لە ( هون ) بەکاردێ • سەرنجڕاکێش ، ئەوەیە کە لەنێو نووسەرانی کورددا تەنیا مامۆستا جگەرخوێن ( هون )ی تۆمارکردووە •

ئەگەرچی نووسەر باش دوو دەستە جێناوی کەسیی جودای لە کرمانجیی ژووروودا دەستنیشان کردووە ، بەلام ئەوەی یادداشت نەکردووە . کە ئەو دوو دەستەیە بەپێی دۆخ جیادەبنەوە •

دابەشکردنی جێناوە کەسییە جوداکانو چۆنیەتی بەکارهێنانیانو بەراوردکردنیان لە لایەن زانایانی کوردو بێگانەوە ، بە زمانی کوردیو بێگانە تا ڕادەیەك باسکراوە ، کەچی د• وریا پەنجەی بۆ هیچ یەکێك لەو سەرچاوانە ڕانەکێشاوە •

ئەو نموونانەی نووسەر بۆ ئیسپاتکردنی باسەکەی هێناونیەوە ، لە قووڵایی زمانی کوردییەوە نیین ، واتە لە فۆلکلۆرو ئەدەبو •••ی

(٣٤) د. وریا عومەر ئەمین ، لایەنێکی جیاوازی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » ، ب١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٥٤ ـ ٢٧٦ •

(٣٥) بڕوانە لاپەڕە ( ٢٧ ) •

(٣٦) بڕوانە لاپەڕە ( ٨٠ ) •

تۆمارکراوەوە نین ، بەڵکو ڕستەی سادەی زمانی خۆی یان ئاسیاویکێتنی٠٠ و هەندێکی‌تر ٠

د٠ وریا لە وتاری ناوبراودا ، کە بەشێکی زۆری دەربارەی جێناوی کەسیی لکاوە ( ل ٢٦١-٢٧٤ )و لە وتاری « ڕێزمانی ڕاناوی لکاو »دا[٣٧] و « پەیوەندی ڕاناوو فرمان ـــە کرمانجیـــی ژووروودا »دا[٣٨] ، کـە سەرلەبەریان باسی جێناوە لکاوەکانی زمانی کوردییە ، زانیاریی باشـــو ڕاستی لەبارەی ئەو کێشەیەوە تۆمارکردووە ، بەتایبەتی لە نیشـــاندانو دەورو چۆنیەتی دەرکەوتنو ئاڵوگۆڕکردن ٠٠٠ی جێناوەکاندا ٠ مەبەستی سەرەکیی نووســـەر لەم لێکۆڵینەوانەدا ڕوونکردنەوەی دەوری جێناوی لکاوە لە ڕستەدا ، جا بۆیە ڕووی مۆرفۆلۆژی بایەخ پێنەداوە ٠٠٠ کەمو کورتی ئەو بەشانەی وتارە ناوبراوەکانی د٠ وریا ، کە پێوەندیان بەم باسەی ئێمەوە هەیە ، بەتایبەتی لە دەری‌کردنی فۆرمی جێناوەکاندایە ٠ ئەویش لە کەسی دووەمو سێیەم تاکی دەستەی دووەمدا ٠٠٠ بەڵام نابێ ئەوە لەیـاد بکەین ، کـــە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە ، بەتایبـــەتی لـــە مـەیـــدانی کێشە جۆربەجۆرەکانی جێناوی لکاودا جێی دیارو بەرزیان وەرگرتووە ٠

بەرهەمی لیژنەی زمانی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەســتەی کـــورد ، کـــــە بـەنـاوی « بـەراوردکـــاریی لـــە نێـــوان زارە کوردیێکاندا »وەیە[٣٩] چەند لاپەڕەیەکی کەمی کۆتایی لەبارەی جێناوی

---

(٣٧) د٠ وریا عومەر ئەمین ، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٦٨ ـ ٧٤ ٠

(٣٨) د٠ وریا عومەر ئەمین ، پەیوەندی ڕاناوو فرمـــان لـــە کرمـــانجیی ژووروودا ، گۆڤـــاری « کـــاروان » ، ژ ٢ ، هەولێـــر ، ١٩٨٢ ، ل ٤١ ـ ٤٣ ٠

(٣٩) لیژنەی زمانی کوردی ، بەراوردکاریی لە نێوان زارە کوردی‌یەکاندا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەســـــــتەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٧٧ ـ ٣٣٧ ٠

کەسیی جوداوەیە ( ل ٣٢٩ ـ ٣٣٧ )و چەند لاپەڕەیەکیشـــی دەربارەی جێناوی کەسیی لکاوە ( ل ٣١٧ ـ ٣٢٩ ) •

ئەم کارە وێڕای ئـەوەی کە هەمووی ( ٦٠ ) لاپەڕەیەك دەبێتو بە حەوت هەشت کەس لە ماوەی دوو سێ ساڵدا هێنراوەتە ئەنجام ، هەروەها تا بڵێی ناتەواویو هەڵەشی زۆرە[٤٠] ••• ئێمە لێرەدا تەنیا لـەو کـــەمو کورتیانە دەدوێین کە پێوەندییان بە باسی جێناوەوە هەیە :

★ ئەگەرچی لیژنە دوو دەستە جێناوی کەسیی جودای لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا جیاکردۆتەوە ، بەڵام دەستنیشانی نەکردووە ، کـە بوونی ئەو دوو کۆمەڵە پێوەندی بە دۆخی ڕاستەوخۆو دۆخی تیانەوە هەیەو ئەمەش واقیعی سەرەکی مەسەلەکەیە •

★ لیژنە لە لیستەکەدا بۆ کەسی سێیەمی تاکی کۆمەڵی دووەمـــی کرمانجیی ژووروو ، هەر ( وێ ، وی )ی نووســـــیوەو ناوی ( ئەوێ ، ئەوی )ی نەبردووەو سەرەڕای ئەوەش ، ئەوەی یادداشت نەکردووە ، کە ( وێ ) بۆ مێیەو ( وی ) بۆ نێرە ( بڕوانە : ل ٣٢٩ ) •

★ بێ گومان ، باشە کە هەندێ تایبەتێتی بەشـــە دیالێکتی لوڕیو هەورامانی باس کردووە ، بەڵام گەلێ تایبەتێتی ســــلێمانیو موکریـانو سۆران ••• هەر ناوی نەبردوون •

★ وێڕای ئەوەی نموونەی کەم هێنراوەتەوە ، هەروەها نموونەکانیش لە قووڵایی زمانی کوردییەوە هەڵنەهێنجراون •

★ لە باسی بەکارهێنانی جێناوەکانو نموونە هێنانەوە بۆیاندا هەندێ هەڵە دەبینرێ . بە نموونە لە لاپەڕە ( ٣٣٥ )دا ، کاتێ باســـی بەکارهێنانی جێناوی ( ئەو ) کراوە ، وا وتراوە ، کە گوایا بەکاردێ لەگەڵ :

---

(٤٠) دەربارەی ئەو بەرهەمەی لیژنە باسێکی تایبەتیم هەیە ، هیوادارم بەم زووانە بە وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێز •

« ٢ ـ کاری تێنەپەڕ بە هەموو چەشنەکانیەوە ، وەك : ئەو ڤست •

٣ ـ لەگەڵ کاری تێپەڕدا ، لە کاتی ئێستاو ئایندەدا ، وەك :

ئەو دڤە ـ ئەو دڤت

ئەو دێ ڤت ـ دێ نبڤت » •

لیژنە ڕاستە کە لە خاڵی دووەمدا ( ڤســـت )ی بە کرداری تێنەپەڕ داناوە ، بەڵام چۆن پاش دێڕێك ـ واتە لە خاڵی سێیەمدا ـ بووە بە تێپەڕ ؟ وێڕای ئەوە لیژنە کە لە خاڵی دووەمدا دەڵێ « لەگەڵ کرداری تێنەپەڕ بـە هەموو چەشنەکانی‌یەوە » . ئەی بۆچی نموونەی تەنیا بۆ دەمی ڕابوردوو هێناوەتەوە ؟•••

••• هتد •

وەك نیشانمان داوە . زوربەی نووســـەرانی ڕێزمانی کوردی دوو دەستە جێناوی کەســـیی لکاویان دیاری‌کردووە ، کەچی لیژنەی ناوبراو تەنانەت ناوی ئەو هەڵکەوتە ئاشکرایەی زمانی کوردی نەبردووە •

یەکێك لە دیاردە چالاکەکانی ڕێزمانی کوردی‌و یەکێك لە بابەتە کێشە لەسەرەکانی زمانی کوردی مەسەلەی جێناوی کەسیی لکاوە ، کەچی لیژنەی زمانی کوردی کۆڕ توێژاڵێکی تەنکی سەرەوەی گرتووەو بە پچڕپچڕی چەند شتێکی سادەو ساکاری لەسەر نووســـیوە ••• من نایەم بەراوردی ئەم بەرهەمەی لیژنە لەگەڵ وتارەکەی مامۆستا مەسعوود محەمەد بکەم ، کە دە ساڵێك لەمەوبەر بڵاوی‌کردووەتەوە ، چونکە ناگاتـە قولەپێی‌یشی ، بەڵام دەڵێم تەنانەت ناشگاتە ئەژنۆی ئەو باسانەی ، کە دە وریا عومـەر ئەمین‌و مامۆســـتا نووری عەلی ئەمین ســـەبارەت بە جێناوی لکاو نووسیویانە ••• جا دەبێ تەفســـیری ئەمە چی بێ ، کە کاری لیژنەیەکی حەوت هەشـت کەسی . نەك هەر نەگاتە کاری کەســـێکی دوور ، بەڵکو نەگاتە نووسینی تایبەتی کۆنتری دوان لە ئەندامەکانی خۆیشی •

ماموٚستا نووری عەلی ئەمین پتر لە بیست ساڵ لەمەوبەر دوو دەستە جێناوی لکاوی جیاکردۆتەوە ... لەم ساڵانەی دواییشدا دە وریا بـــە شێوازێکی زانستییانەتر جیاوازیی ئەو دوو دەستە جێناودی نیشانداوە .. بەڵام لیژنە نە لە یەکی جیاکردوونەتەوەو نە باســـی بوونی ئەو دیاردەیەی کردووە ...

قەڵەم توانستی باسی هەموو هەڵەو ناتەواوییەکانی ئەو کارەی لیژنەی نییەو تەنیا لەبارەی حاڵەتی کەسی دووەمو سێیەمی تاکی جێناوە لکاوەکانەوە دەدوێین . چونکە ئەوان کێشەی گرنگی ئەم باسەن :

لیژنە بۆ کەسی دووەمی تاك تەنیا باسی (ت)ی کردووەو ئەویش زۆر بە کورتیو هەروەها دیاریشی نەکردووە سەر بە کام دەستەیە ... لـــەو نەخشەیەی لە لاپەڕە ( ٣٢٩ )دا بۆ جێناوە لکاوەکانی ســـازکردووە لەتەك (ت)ەوە (یت)یشی داناوەو هەر ئەوەندە ... ئەگەرچی ئێمە تێدەگەین ئەو (یت)ە بۆ دەستەی دووەمە ، بەڵام هەقمانە لە لیژنە بپرسین : ئەم جێناوە کە لە ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا لە شێوەی (ی)دا دەبینرێو دواتر (ت)ش وەك زیادەی گەردانی کردار هاتۆتە سەری ئیتر بۆ دەبێ (یت) بێ ؟... ئەو جێناوە هەر دەچێتە ســـــەر کردار یان بەشـــە ئاخاوتنەکانی تریش ؟... بە کرداری تێپەڕەوە دەلکێ یان تێنەپەڕەوە ؟... لە ڕستەدا چۆن خۆی دەنوێنێ ؟...

لیژنە کاتێ باسی جێناوی (ی) دەکا ، نەك هەر نەیوتووە ئەمە بۆ کەسی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەمەو نەك هیچیشی لەبارەی دەورو دمرکەوتنو خۆنواندنییەوە نەنووســـــیوە ... بەڵکو تەنیا بە چەند دێڕێك ئەوەی نیشانداوە کە لە لوڕیو هەورامانیو کرمانجی ژووروودا چۆن دێت ... بەڵام بەداخەوە ، زوربەی ئەمەشی بە هەڵە لێكداوەتەوە . بەوێنە لیژنە وا ڕادەگەیەنێ ، کە « ئەم ڕاناوە لە زاری لوڕیدا دەرناکەوێ » ( ل ٣٢٢ ـ ٣٢٣ ) . کەچی لە ( نوێشکێ لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە )دا ، کـــــە

پاشکۆی « فەرهەنگی لەکۆ لوڕ »ە[41]، بە ڕوونی ئەوە دیاری کراوە ، کە (ی) جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکەو چەند نموونەیەکیش هێنراوەتەوە، وەك : « هەنی ( دەبی ) » ( ل ٢٢٤ ) ؛ « مووی ( دەبی ) » ( ل ٢٢٧ )٠٠

هەروەها بۆ کەسی سێیەمی تاك لیژنە لە لاپەڕە ( ٣٢٧ )دا « ت ، یت »ی دەستنیشان کردووەو لە لاپەڕە ( ٣٢٩ )یشدا ( ان ، تیت )٠٠٠٠ بەڕاستی ئەمەی کارێکی یەکجار بێسەروبەرە ٠ لیژنە نەك هەر لـــــە دیاری کردنی ئەو جێناوانەدا هەڵەی گەورەی کردووەو فۆرمی وای داناوە ، کە لە زمانی کوردیدا نییە . بەڵکو سەیرو سەمەرە ئەوەشە لە دوو شوێنی یەکجار لەیەك نێزیکدا بە دوو چەشنی تەواو لەیەك دوور وێنەی کێشاون ٠

د٠ ئیبراهیم پوور لە لاپەڕە ( ١٠-١٣ )ی کتێبی « دســـــتور زبان کردی »دا[42] بە کورتی لە جێناو دواوەو بەسەر دوو جۆردا دابەشـــی کردووە : « ١ - ضمیر شخصی » ( ل ١١-١٢ ) ؛ « ٢ - ضمیر اشاره » ( ل ١٢-١٣ )٠ هەرچی جێناوی کەســـیشـــە کردوویە بە دوو بەش : « ١ - ضمیر منفصل » ( ل ١١ ) ؛ « ٢ - ضمیر متصل » ( ل ١١ - ١٢ ) ٠

نووسەر نەخشەیەکی بۆ جێناوی کەسیی جودا لە بەشە دیالێکتەکانی مەهابادو سنەو هەوراماڵو کرماشاندا ڕێکخســـتووەو هەروەها بە چەند دێڕێك لەبارەی بەکارهێنانیانو ئەرکیانو دەوریانەوە دواوە ٠٠٠ بە کورتی لە جێناوی لکاو دواوەو ئەوانەی دیاری کردووە کە لە بەشە دیالێکتەکانی سنەو هەوراماڵو کرماشاندا بەدەردەکەونو وا ڕادەگەیەنێ کە سێ حاڵەت : « أ - ضمیر متصل فاعلی ؛ ب - ضمیر متصـــل مفعول ؛ ج - ضمیر متصل اضافی »ی هەیەو بە پێی ڕێژەی تێپەڕیو تێنەپەڕی کردار خۆیان دەنوێنن ( ل ١٠-١١ ) ٠

---

(٤١) حەمید ئێزەد پەناه : فەرهەنگی لەکو لوڕ ( لێدوانو بەراوردکردنی : مەحموود زامدار ) ، بەغدا ، ١٩٧٨ ٠

(٤٢) دکتر ابراهیم پور ٠ دستور زبان کردی ، تهران ؟

له هەندێ لەو کارە زمانەوانییانەدا کە کوردناسانی سۆڤێت : د• قەناتی کوردۆ ، د• چەرکەزی بەکــۆ ، د• کەریمــی ئەیووبــی‌و د• نی• ئا• سمیرنۆڤا . د• مەکسیمی خەمۆ ، د• ڕ• ل• تسابۆلۆڤ ••• نووسیویانە ، چاومان بە باسی جێناو دەکەوێ •

د• قەناتی کوردۆ لە تێکڕای ئەو کتێبانەیدا کە لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە نووسیونی باسی جێناوی کردووە[٤٣] ••• لەبەر ئەوەی کاری هەرە گەورەو دیارو زانستی د• قەناتی کوردۆ کتێبی « دەستووری زمانی کوردی ( بــە کەرەســـــــتەی دیالێکتی کرمانجیـی ژووروو و خواروو ) »•• تێیدا بە وردی‌و دوورو درێژی لە جێناو ( ل ٩٩-١٢٠ )ی کۆلیوەتەوە . دەیکەینە کەرەستەو سەرچاوەی سەرەکیی ئەم باسەمان •

شایانی باسە ، کە د• کوردۆ لــە یەکەم بەرهەمیەوە هەســتی بــەوە کردووە ، لە کرمانجیی ژووروودا جێناوی کەســـــــیی جودا دوو دۆخ ( ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ )ی هەیە •

نووسەر لە کاری هەرە دیاری ناوبراویدا لە هەنگاوی یەکەمدا ئەوەی وتووە ، کە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا دەستەیەك جێناوی کەسیی جودا هەیەو لە دیالێکتی ژووروودا دوو دەســــــــتە کە بەپێی دۆخی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دابەش دەبن • دوای ڕیزکردن‌و لێدوان‌و نەخشـــــەی

---

(٤٣) بە وێنە ، بڕوانە :

أ ــ د. قەناتی کوردۆ ، گراماتیکا زمانێ کوردی ، چاپی ســێیەم ، یەریڤان ، ١٩٦٠ ، ل ٩٦ ــ ١١٢ •

ب ــ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆییێف ) ، دەستووری زمــانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٠٤ ــ ١٢٥ •

ج ــ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆییێف ) ، دەســـتووری زمانی کوردی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو )، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٩٩ ــ ١٢٠ •

گۆڕانی ئــەو جێناوانە ، ئنجا لەگەڵ یەکتــر بەراوردی کردوونو بەپێی توانست لە پەیدابوونی هەندێکیانی کۆڵیوەتەوەو لە چۆنیەتی بەکارهێنانیاز دواوەو دواتریش باسی تایبەتێتی هەندێ بەشە دیالێکتی کردووە •

هەرچەندە دە• کــوردۆ زانیاریــی باش‌و نوێــی تۆمارکردووەو بە شێوەیەکی زانســتی‌یانە لێیان کۆڵیوەنەوە ، بەڵام ناوەناوە تێکەڵکردن لە کارەکەیدا دەبینرێ‌و هەروەها چەند ڕووی گرنگیش هەن باس نەکراون •

نووسەر لە گشت ئەو کتێبانەدا کاتێ لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە جێناوی لکاو دواوە ، تەنیا بــــــی (ێ)ی کردووە[٤٤] ••• هەرچی جێناوەکانی دەســـتەی دووەمە لە بەشـــــی « کۆتایی کردار »دا لێیانی کۆڵیوەتەوە •

بە ڕای مـــن ئەو (ێ)یەی دە• قەناتی کوردۆو گەلێکی‌تر بە جێناوی گشتیی دۆخی تیانی دادەنێن ، وەك پێشتر نیشـــانمدا ، جێناو نییە ••• هەرچی دەستەی دووەمیشە ، کە بە کۆتایی کرداریان لەقەڵەم داوە ، هەموو بەڵگەیەك ئەوە دەگەیەنن ، کە جێناوی کەسیی لکاون •

دە• قەناتی کوردۆ لە کتێبی « دەســـــــــتووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو خواروو ) »دا بە دوورو درێژی لە جێناوی کەسیی لکاو ( ل ١٠٤–١١١ )ی کۆڵیوەتەوە •

---

(٤٤) بە وێنــە ، بڕوانــە :

أ ــ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆییێف ) ، ســـــــەرچاوەی ناوبراو ، گراماتیکا زمانێ کوردی ، ل ١١١ .

ب ــ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆییێف ) ، ســـــــەرچاوەی ناوبــراو ، دەستووری زمانی کوردی ، ل ١٠٧ .

ج ــ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆییێف ) ، زمانی کوردی ، مۆســـکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٣٢ ــ ٣٣ .

نووسەر لە سەرەتادا ئەوەی دیاری کردووە ، کە (یّ ، ین ، ن ) دەستەیەك جێناوەنو لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا بەکاردێن ... دوای لێدوانی لەم دەستەیە ، ئنجا ئەوەی نیشانداوە ، کە ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ) دەستەیەك جێناوی لکاونو لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا لە مەودایەکی فراواندا دەور دەبینن ... دواتر لە چۆنیەتی بەکارهێنانیانو شێوەی خۆنواندنیان لەگەڵ کرداری سادەو ناسادەدا دواوە ...

هەرچەندە د. کوردۆ دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی وەك کۆتایی کردار تەماشاکردووە ( بڕوانە : ل ١٦٥–١٨٨ )، بەڵام زانیاریی باشی لەبارەیانەوە تۆمارکردووە ، بەتایبەتی لە نیشاندانی ئەو حاڵەتانەدا ، کە کاتێ لە کرمانجیی خوارووی دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان دەچنە سەر کرداری رابوردووی تێپەڕو لە کرمانجیی ژووروودا نینو دەرناکەون چی جێگەیان دەگرێتەوەو چۆن دەردەبڕرێن .

د. قەناتی کوردۆ وێڕای جێناوی کەسیی جوداو جێناوی کەسیی لکاو ، چەند گرووپێکی تریشی دەستنیشان کردووەو لێیاندواوە ، وەك : « جێناوی نیشانە » ( ل ١١١–١١٣ ) ؛ « جێناوی خۆیی » ( ل ١١٤ ) ؛ « جێناوی هاوبەشی » ( ل ١١٤–١١٥ ) ؛ « جێناوی پرسیار » ( ل ١١٥–١١٦ ) ؛ « جێناوی هەیی » ( ل ١١٦–١١٧ ) ؛ « جێناوی دیار » ( ل ١١٧–١١٨ ) ؛ « جێناوی نادیاری چەندی » ( ل ١١٨–١١٩ ) ؛ « جێناوی نادیار » ( ل ١١٩ ) ؛ « جێناوی نەفی » ( ل ١١٩ ) .

نووسەر لە باسی جێناوی خۆییدا وا ڕادەگەیەنێ کە مۆرفێمی ( خۆ ) جێناوی خۆییەو دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) وەردەگرێو دەبێتە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) ... ئەگەرچی د. کوردۆ ڕاست بۆ دیاریکردنی فۆرمی ئەو جێناوە چووە ، بەڵام ناتەواویی ئەوەیە ، کە تەنیا حاڵەتی پێوەلکاندنی

جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەمی باس‌کردووەو بە هیچ چەشنێك ئـەوەی یادداشت نەکردووە کە جێناوی ( خۆ ) جێناوێکی لکاوی دەستەی دووەم یان دوو جێناوی دەستەی یەکەم پێکەوە یان جێناوێکی دەسـتەی یەکەم‌و بەدوایدا جێناوێکی دەستەی دووەم یان ( ش/یش )ی پێوەندی‌و بەدوایدا جێناوێکی دەستەی یەکەم ... یش وەردەگرێ •

کەم‌و کورتی باسی « جێناوی هەیی » بەتایبەتی لەوەدایە ، کە نووسەر نیشانەکانی ئیزافەشی بە جێناوی هەیی داناوە • ئەگەرچی ڕاستە ئــەم **نیشانانەی ئەو بـە جێناوی هەیی لە قەڵەم داون لـە ڕەسـەندا لە جێناوی** هەیی‌یەوە کەوتوونەتەوە ، بەڵام بوون بە نیشانەو لە جێناوی شۆڕاون •

ناتەواوی دە• قەناتی کەردۆ لە باسی « جێناوی پرسیار »دا ، ئەوەیە هەندێ جێناو یان بەشێك لە فۆرمی ئاشـکرای هەندێ جێناوی هەردوو دیالێکتی ژووروو و خـوارووی ناونەبردووە • بەوێنـە : لە دیالێکتی ژوورووداجێناوی ( کا/کانێ ) ؛ ( کیرێ/کیدەرێ/کوێدەرێ/کوو )ی یادداشت نەکردووەو لە دیالێکتی خوارووی ( کوا/کوانـێ ) ؛ ( کوێ/ کوێندەرێ )ی تۆمارنەکردووە ... لە دیالێکتی ژوورووی باسـی ( چاوان )ی کردووە ، کەچی فۆرمی ( چاوا ، چەوا )ی ناونەبردووە ... لە دیالێکتی خوارووی لە ( کام ) ؛ ( چۆن ) دواوە ، بەڵام بە لای فۆرمی ( کامە ) ؛ ( چلۆن ، کوو )دا نەچووە ...

... هتد •

دە• چەرکەزی بەکۆش لە کتێبی «زمانی کوردەکانی ئازربایجان»[٤٥]و کتێبی « بەشـە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان »دا[٤٦] باسی جێنـاوی

---

(٤٥) **د• چەرکەزی بەکۆ** ( باکاییڤ ) ، **زمـانی کوردەکانی ئازربایجـان ،** **مۆسکۆ ، ١٩٦٥** ، ل ٥٧ – ٦٥ •

(٤٦) **د• چەرکەزی بەکۆ** ( باکاییڤ ) ، **بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان** **مۆسکۆ ، ١٩٦٢** ، ل ٤٩ – ٥٨ •

کردووەو دواتریش لـە کتێبی « زمـانی کوردەکـانی سـوڤێت »دا[47] باشتر لێی دواوە • مامۆسـتا بەکۆ لەم کتێبەی دواییدا لەسـەر بناغەی کەرەستەیەکی زۆری بەشە دیالێکتەکانی کوردی سـوڤێتو بەراوردکردن لە نێوانیاندا زانایانەو شارەزایانە لە جێناوی کۆلیوەتەوەو یازدە دەستەی دیاریکردووە : « ١ ـ جێناوی کەسـی » ( ل ١٣٨ـ١٤٣ ) ؛ « ٢ ـ جێناوی نیشـانە » ( ل ١٤٣ـ١٤٩ ) ؛ « ٣ ـ جێناوی هەیی » ( ل ١٥٠ـ١٥٥ ) ؛ « ٤ ـ جێناوی هەیی پرسیار » ( ل ١٥٥ـ١٥٧ ) ؛ « ٥ ـ جێناوی چەندێتـی » ( ١٥٧ـ١٥٨ ) ؛ « ٦ ـ جێناوی دیار » ( ل ١٥٨ـ١٦٠ ) ؛ « ٧ ـ جێنـاوی نـادیـار » ( ل ١٦٠ـ١٦٢ ) ؛ « ٨ ـ جێناوی نەفـی » ( ل ١٦٢ـ١٦٣ ) ؛ « ٩ ـ جێناوی خۆیی » ( ل ١٦٣ـ١٦٤ ) ؛ « ١٠ ـ جێناوی خۆیی هاوبەشی » ( ل ١٦٤ـ١٦٥ ) ؛ « ١١ ـ جێناوی لکاو » ( ل ١٦٥ـ١٦٦ ) •

گەلێ بۆچوونو لێکدانەوەی د• بەکۆ هـەر وەك د• قەناتی کوردۆ وایە • بە وێنە ئەمیش دەستەی دووەمی جێنـاوە لکاوەکانی وەك کۆتـایی کردار سەیرکردووە ، بەڵام لەسەر بناغەی کەرەستەیەکی زۆری بەشـە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤێتو بەراوردکردن لە نێوانیاندا ، شارەزایانە لەو کێشەیەی کۆلیوەتەوەو شایانی باسـە ، ئەوەشی دیاریکردووە ، کە لە کرداری رابوردووی تێپەڕدا هاتنو نەهاتنی جێناوە لکاوەکان ( کە ئەو بە کۆتایی کرداری داناون ) بە بوونو نەبوونی بەرکارەوە بەندن •

لە کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری »دا ، کە د• کەریمی ئەیووبیو د• ئی• ئا• سمیرنۆڤا دایاننا وە[48] ، باسی جێناو لە بەشە دیالێکتی موکریدا

---

(٤٧) د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییێف ) ، زمانی کوردەکانی سـوڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٣٧ ـ ١٦٦ .

(٤٨) د. کەریمی ئەیووبی ؛ د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، بەشە دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .

کراوه ( بڕوانه : ل ٤٣–٥٣ )و سیازده جۆر دەستنیشان کراوه : « ١ – جێناوی کەسی » ( ل ٤٤ ) ؛ « ٢ – جێناوی لکاو » ( ل ٤٥–٤٧ ) ؛ « ٣ – جێناوی نیشانه » ( ل ٤٧–٤٨ ) ؛ « ٤ – جێناوی پرسیاری هەیی » ( ل ٤٨–٤٩ ) ؛ « ٥ – جێناوی چەندێتی » ( ٤٩ ) ؛ « ٦ – جێناوی هەیی ( ئی هی ) » ( ل ٤٩–٥٠ ) ؛ « ٧ – جێناوی نادیار » ( ل ٥٠ ) ؛ « ٨ – جێناوی نادیاری نیشانه » ( ل ٥٠ ) ؛ « ٩ – جێناوی نەفی » ( ل ٥٠ ؛ « ١٠ – جێناوی دیار » ( ل ٥٠–٥٢ ) ؛ « ١١ – جێناوی خۆیی » ( ل ٥٢ ) ؛ « ١٢ – جێناوی کەسیی دیار » ( ل ٥٢ ) ؛ « ١٣ – جێناوی خۆیی هاوبەشی » ( ل ٥٣ ) •

کەمو کورتی باسی جێناوی کەسیی جودای ئەم کاره ئەوەیە ، کە هەندێ تایبەتێتی ئاشکرای ئەو بەشە دیالێکتە باس نەکراوەو نموونە لە فۆلکلۆرو ئەدەبەوە نەهێنراوەتەوەو چەند حاڵەتی گرنگی بەکارهێنانی جێناوەکان یادداشت نەکراوە •

نووسەرانی ئەم کتێبە لە باسی جێناوی لکاودا وایان نیشانداوە کە جگە لە دوو دەستە جێناوی لکاو ، هەروەها (ێ)یش جێناوێکی گشتییە ••

لەبارەی باسی جێناوی لکاوی ئەم بەرهەمەوە سەرنج بۆ چەند خاڵێك ڕادەکێشم :

١ – نووسەرانی ئەم کتێبە ، هەروەك مامۆستا مەسعوود محەمەد ، فۆرمی دەستەی دووەمی جێناوەکانیان دیاریکردووە ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان نەهێناوەتەوە •

٢ – ڕاست بۆ ئەوە چوون ، کە لە بەشە دیالێکتی موکریدا لە جێناوەکانی دەستەی دووەمدا بۆ کەسی یەکەمی کۆ ، جگە لە ( مان ) لە زوودا شێوەی (ن)ش هەبووە ••• بۆ کەسی دووەمی کۆ ، هەروەها

( وو )ش جێناوی کەسیی لکاوە ، بەڵام لە ( تان ) کەمتر بەکاردەبرێ ...
دەبوو ئەو ڕایەیان بە نموونەو بەڵگە پتەو بکەن .

٣ ـ دەڵێن : « ئەو وشـانەی کۆتاییان بە بزوێنی ( ی ـ I ) هاتووە جێناوی لکاوی ( ی ـ I ) کەسی سـێیەمی تاك وەرناگرن . لەو حاڵەتانەدا جێناوی جودایان بۆ بەکاردێنرێ ، وەك : جوانی وی » .

٤ ـ د. کەریمی ئەیووبیو د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا تا ڕادەیەك باش لە چۆنیەتی بەکارهێنانی (ێ) دواون ، بەڵام هەڵەیان لەوەدایە ، کـە بـە جێناوی لکاویان لەقەڵەم داوە .

ئەمانیش هـــەر وەك د. قەناتی کوردۆو د. چەرکەزی بەکۆ وایان ڕاگەیاندووە کە مۆرفێمی ( خۆ ) جێناوی خۆیی‌یەو دەســـتەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) وەردەگرێو دەبێتە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) ...

نووسەرانی ناوبراو لە باسی جێناوی پرســـیاردا ، هەندێ جێناوی ئێجگار ئاشکراو باوی بەشـە دیالێکتی موکری‌یان ناونەبردووە . وەك : ( چلۆن ، کەنگێ ، کوا ـ کوانێ ... ) . لە بەشـــی جێناوی چەندێتی‌دا تەنیا ( چەند . هێندە ، ئەوەندە )یان یادداشتکردووە . کاتێ لە جێناوی هاوبەشـــی دواون هەر باســـی ( یەکتر/یەکتری )یان کردووەو بەلای ( یەکدی )دا نەچوون ، کە لە بەشە دیالێکتی موکریدا زۆر باوە ...

د. مەکسیمی خەمۆ لەو کارە زانستی‌یەیدا ، کە بەناوی « زمانـــی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق »ەوە بڵاوی‌کردۆتەوە[٤٩] لـــــە جێناوی کەسی جودا دواوە ( ل ٣٣١ـ٣٣٢ ) . نووسەر ئەو جێناوانە لـە

---

(٤٩) د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عیراق ، کتێبی « وڵاتانو میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیكو ناوەڕاست » ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٢٧٣ ـ ٣٨٢ .

بەشە دیالێکتەکانی ئاکری ، ئامێدی ، شێخان ، ئەترووش ، بامەڕنی چۆن بەکاردێن بەو چەشـــــنە خستوونی‌یە پێش‌چاوو لەگەڵ یەکتری بەراوردی کردوون ... نووسەر باسی هیچ جێناوێکی کەسیی لکاوی نەکردووە . بەڵام لە بەشی « کۆتایی کردار » ( ٣٤١-٣٥١ )دا ، ئەوەی دەست‌نیشان کردووە ، کە لە بەشە دیالێکتەکانی بادینانداا ( م ، ت ، یت ، ن/ین ، ن ، ن ) دەبینرێن ... لەو هەموو جێناوە زۆرەی پرســــــیاردا تەنیا ناوی ( کی/کێ/کیشك )و (چ)ی بردووە ( ل ٣٣٣ )و باسەکەی بە پێنج‌دێڕێك بڕانۆتەوە ... ئەمیش وەك تێکڕای کوردناسانی سۆڤێت وای ڕاگەیاندووە کە مۆرفێمی ( خۆ ) جێناوی خۆیی‌یەو دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان وەردەگرن ...

ئەم نووســەرە جێناوی بەســـەر پێنج دەســـتەدا دابەش کردووە : « ١ - جێناوی کەسی » ( ل ٣٣١-٣٣٢ ) ؛ « ٢ - جێناوی نیشانە » ( ل ٣٣٢-٣٣٣ ) ؛ « ٣ - جێناوی هاوبەشی » ( ل ٣٣٣ ) ؛ « ٤ - جێناوی پرسیار » ( ل ٣٣٣ ) ؛ « ٥ - جێناوی خۆیی » ( ل ٣٣٤ ) .

د. ڕ. ل. تســــــابۆلۆف لە کتێبی « لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردی‌یەوە »دا[٥٠] باسی جێناوی کردووە ( ل ١٨-٣١ )و حەوت جۆری سەرەکیی دیاری‌کردووە : « ١ - جێناوی کەسیی : أ - تەواو یـــان سەربەخۆ ؛ ب - کورت یان لکاو ؛ ج - کەســـیی خۆیی » ( ل ١٨-٢٨ ) ؛ « ٢ - جێناوی نیشانە » ( ل ٢٩ ) ؛ « ٣ - جێناوی پرسیار » ( ل ٢٩-٣٠ ) ؛ « ٤ - جێناوی هەیی » ( ل ٣٠-٣١ ) ؛ « ٥ - جێناوی چەندێتی » ( ل ٣١ ) ؛ « ٦ - جێناوی نادیار » ( ٣١ ) ؛ « ٧ - جێناوی هاوبەشی » ( ل ٣١ ) .

---

(٥٠) د. ڕ. ل. تســــــابۆلۆف ، لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردیەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

ڕووی باش‌و سەرکەوتووی ئەم کارە بەتایبەتی لەوەدایە نووسەرەکەی بەشێکی زۆری ئەو جێناوانەی لێیان دواوە ، لەگەڵ ئاوێستاو فارسیی کۆن‌و ... دا بەراوردی کردوون . ناتەواویی دیاریشی ، ئەوەیە هەندی گرووپی زۆر ئاشکرای باس نەکردووەو چەند جۆرێکی بێ‌گومانی بە ناو یان ئاوەڵناو لەقەڵەمداوە .

لەنێو ئەو کارانەی بە زمانە ڕۆژئاواییەکان لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە نووسراون ، سەیری کتێبەکانی : دە ئەرنست مەکارۆس‌و دە مەکەنزی‌و دە جۆیس بلۆ دەکەین .

دە ئەرنست مەکارۆس لە لاپەڕە ( ٥١ )ی ئەو کتێبی « ڕێزمانی کوردی »یەیدا ، کە سەبارەت بە شێوەی سلێمانی‌یەو سالی ١٩٥٨ لە نیۆیۆرك بلاوی‌کردووەتەوە[٥١] تەنیا جێناوە کەسی‌یە جوداکان‌و جێناوە کەسی‌یە لکاوەکانی دەستەی یەکەمی دیاری‌کردووە . جێناوە کەسی‌یە جوداکانی بەسەر کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمی تاك‌و کودا دابەش‌کردووەو وتوویەتی کە کەسی سێیەمی کۆ لە کەسی سێیەمی تاك بە یاریدەی نیشانەی (ان)ی کۆ سازبووە . نووسەر دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی بە کۆتایی کردار داناوەو لە بەشی ( کۆتایی کردار )دا لێیان دواوە . وێڕای کورتیی باسەکە بە تێکڕایی ، هەروەها هەڵە لە دیاری‌کردنی فۆرمی کەسی دووەم‌و سێیەمی تاکی دەستەی دووەمدا دەبینرێ ، ئەویش ئەوەیە ، فۆرمی (یت)ی بۆ کەسی دووەمی تاك‌و ( ێت ، ات )ی بۆ کەسی سێیەمی تاك داناوە .

دە مەکەنزی لە سەرەتای باسی جێناوی کەسیی جودادا ئەوەی وتووە ، کە ئەو جێناوانە لە دیالێکتی ژووروودا بەپێی دۆخی ڕاستەوخۆو دۆخی تیاز دابەش‌دەبن . وێڕای ئەمەو هەندێ تۆژینەوە لەو باسە ،

(51) Ernest N. Mccarus, A Kurdish Grammar, New - York, 1958, p. 51.

هەروەها لە بەشە دیالێکتەکانی ( سـوورچیو ئاکریو ئامێدیو زاخۆو شێخان ... )دا فۆرمی جیاوازیانی نیشانداوە[٥٢] .

د. مەکەنزی سـەرەڕای ئەوەی باش فۆرمی جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەمی نیشـانداوە ، هـەروەهـا تایبەتێتی هەنـدێ ناوچەشی خستۆتە پێش‌چاو[٥٣] . بەوێنە وا ڕادەگەیەنێ لە ناوچەی وارماوە بـۆ کەسی دووەمی تاك ، جگە لە (ت) ، هەروەها ( و-یو )ش لە ئاواندایە ... لە ناوچەی پژدەرو موکریو ڕەواندز بۆ کەسـی دووەمی کۆ ( وو-یو )و بۆ کەسی یەکەمی کۆ (ن)ش بەکاردێنرێن[٥٤] .

ئەم زانایە ، وەك گەلێ لە نووسەرانی دی جێناوەکانی دەسـتەی دووەمی بە کۆتایی کردار داناوە و سەرەڕای ئەوەش وای نیشانداوە ، بـۆ کەسی دووەمی تاك لە سلێمانیو وارماوە ( ی/یت )و لە بنگردو پژدەرو موکریانو هەولێرو ڕەواندزو خۆشناوەتی ( ی ) بەکاردێو بۆ کـەسـی سێیەمی تاکیش لە سـلێمانیو وارماوە ( ێ/ێت ) ؛ لە بنگردو پژدەرو موکریان ( ێ/ێت ) ، ( ی/یت ) ؛ لە هەولێرو ڕەواندزو خۆشـناوەتی ( ی/تن/ت ) بەکاردێنرێن ( ل ١١٠ ) .

د. مەکەنزی لە هەردوو کتێبی ناوبراویدا جگە لە باسی ( جێناوی کەسیی جودا )و ( جێناوی کەسیی لکاو ) لە ( جێناوی نیشانە ) و ( جێناوی پرسیار )یش دواوە .

(52) D.N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961, pp. 171-173.

(53) D.N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1957.

(٥٤) بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیەی د. مەکەنزی ، دەبێ جیاوازی حاڵەتی کەسی دووەمی تاكو کۆ کورتیو درێژی ( و ) دەری ببڕێ ، بەڵام تێکسـتی تۆمارکراوی کوردی ، ئەوە ئیسپات ناکەن ، بەڵکو ئەوە نیشاندەدەن ، کە ( وو ) بۆ هەردوو حاڵەت بەکاردێ .

د• جۆیس بلۆ لە کتێبی MANUEL DE KURDE (Dialecte Sorani) دا[55] ( من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان )ی لەژێر سەرباســـــی « جێناوی کەسیی جودا »دا بە کورتی باسکردووە ( ل ٤٨ ) • لە لاپەرە ( ٥٥–٥٦ )یشدا ( م ، ت ، ی ، مان ، تان )ی لەژێر ســـەرناوی « جێناوی کەسیی لکاو »دا بە کورتی دواوە • هەرچی دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانە وەك کۆتایی کرداری تەماشاکردوونو لە بەشی کرداردا لێیان دواوە • بۆ کەســـــی تاکی ئەو دەســـــتەی دووەمە ( ێ/یت )ی دیاریکردووەو بۆ کەسی سێیەمیتاکیش ( ێ/ێت ، آ/آت ، ێ/یت )ی داناوە ( ل ٥٠–٥٣ )• هەرچی جێناوی لکاوی (ە)شە بەکرداری « بوون » ( فعل الکینونە – Verb to be )ی لەقەڵەم داوە •

سەرەڕای ئەو چەند بەرهەمەی لە ســـەرەوە لێیان دواین ، هەندێ کتێبو نامیلکەو وتاری دیکەش هەن کە باسی جێناویان تێداکراوە ، بەڵام بەداخەوە لێرەدا مەودانییە باسی هەموویان بکەین •

★ ★ ★

تا ئێرە – واتە دوای کەمێ نیشاندانی ئەوەی چی لەبارەی جێناوەوە لە زمانی کوردیدا نووسراوە – ئەوەمان بۆ ڕوونبووەوە ، کە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەســـــــــەر جۆرەکانی جێناو لـــە زمانی کوردیدا ڕێكنەکەوتوونو بەشێکی زۆری ئەو باسانەی دەربارەی ئەم کێشـــەیە نووسراون سادەو ســـاکارنو هەڵەو ناتەواویو کەمو کورتییان تێدایەو بەلای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوونو تیشـــکی ڕووناکییان ئاراســـتەی گەلێك ڕووی نەکردووەو ئەنجامێکی ســـەرکەوتوویان وەدەســـت نەهێناوە ••• ، بـــەڵام چەنـــد کارێك هەیە ، بەتایبەتی ئەوەی د• قەناتی

(55) Joyce Blau, Manue De Kurde, Paris 1980.

کوردۆو د٠ چەرکەزی بەکۆو د٠ مەکەنزیو د٠ کەریسی ئەیووبیو د٠ ئی٠ ئا٠ سمیرنۆڤا ٠٠٠ لە باسی تێکڕای جێناوەکانداو ئەوەی د٠ نەبەز ٠٠٠ نە باسی جێناوی کەسیی جودا‌داو ئەوەی مامۆستا مەســــعوود محەمەدو د٠ وریا ٠٠٠ لە باســــی جێناوی کەســــیی لکاوداو ئەوەی د٠ ڕ٠ ڵ٠ تــــابۆلۆڤ ٠٠٠ لە باسی جێناوی هاوبەشیدا ٠٠٠ کە لەســـەر بناغەی کەرەستەی باشو شێوازی زانستی نووســــراون ٠ ئەگەرچی ئەو جۆرە هەولانە گەلێ ڕووی جێناویان ساغ‌کردووەتەوە ، بەلام هێشــتا چەندین نادیاریو تەمومژ بەسەر ئەو کێشەیەی زمانەکەمانەوە هەیە ئاشکرا نەکراونو نەڕەوێنراونەتەوەو تەنانەت هەندێ شتی زۆر ئاشکراش دەبینین کــە بــە هیچ چەشنێك نەخراونەتە سەر کاغەز ٠

تێکڕای ئەو نووسەرانەی باسی جێناوی کەسیی جودایان لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا کردووە ، نەك هــەر گەلێ تایبەتێتی ئەو جێناوانەیان باس‌نەکردووە ، بەلکو هەندێ فۆرمی ئاشکرای لە زووددا باویشیان باس نەکردووە ٠٠٠ ئەوانەش کە دەربارەی جێناوی کەسیی جودا لــە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دواون ، ئەگەرچی زوربەیان دوو دەســـتە جێناویان دیاری‌کردووە ، بەلام بەشــــێکیان بۆ ئەوە نەچوون ، کــە بەپێی دۆخی ڕاستەوخۆو دۆخی تیان دابەش‌دەبن ٠

زوربەی ئەو نووسـەرانەی دەربارەی جێناوی کەســــیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووددا دواون ، ئەگەرچی تا ڕادەیەك لەسەر ئەوە هاودەنگن کە دوو دەستە جێناوی لکاو لەو دیالێکتەدا هەیە ٠٠٠ بەلام لە دیاری‌کردنی هەندێ جێناودا جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە ٠

دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە دەمەتەقێیەکی ئەوتۆی لەسەر نییە ٠ هەرچی دەســــتەی دووەمە لە دوو ڕووەوە جێــی دەمەتەقێیە ٠ ڕووی یەکەمیان ، ئەوەیە کەمێ لە زمانەوانان ئەم دەســتەیە بە جێناو دانانێن ٠

ڕووی دووەم ، کە بناغەی مەسەلەکەیە ، ئەوەی ، ئەوانەی بە جێناویان داناوە یان بە شتێکی دی لە دیاریکردنی بەشێکیاندا جیاوازییەکی تەواو لە نێوانیاندا هەیە ... گومانو دەمەتەقێو کێشەی ئەم دیاردەیە بە شێوەیەکی سەرەکی لە فۆرمی کەسی دووەمو سێیەمی تاکدایە .

دەربارەی کێشەی جێناوی کەسیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا سێ کێشەی سەرەکی هەیە :

١ - بەشێکی گەورەی زانایان ، ئەگەرچی وا ڕادەگەیەنن ، کە دەستەی دووەمی جێناوەکان لەم دیالێکتەشدا وەك دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەردەکەون ، بەلاّم بە کۆتایی کرداریان لەقەڵەمدەدەن .

٢ - زوربەی توێژەران وایان نیشانداوە ، کە لە کرمانجیی ژووروودا دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە نینو هیچ حاڵەتێکی لەو چەشنە نابینرێ ... هەندێکیش ئەوەیان نیشانداوە ، ئەگەرچی لە دیالێکتی ژووروودا دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە بەرچاو ناکەون ، بەلاّم ئەو مەبەستەی جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا دەیگەیەننو ئەو دەورەی دەیبینن ، لە کرمانجیی ژووروودا لە شێوازێکی ئێجگار نێزیکدا دەردەبڕێن .

٣ - ژ‌ێکەی هەموان لەو ڕایەدان ، کە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا تەنیا (ێ) جێناوی لکاوە .

نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە باسی جێناوی خۆییدا دەبنە دوو کۆمەڵ :

کۆمەڵی یەکەم وا ڕادەگەیەنن کە مۆرفێمی ( خۆ ) جێناوی خۆیییەو دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) وەردەگرێو دەبێتە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ،

خۆیان ) ••• کۆمەڵی دووەم وایانداناوە ، کە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) جێناوی خۆییـن ••• وێـڕای جیاوازیی بۆچوون ، هەردوو کۆمەڵ بەلای گەلێ خاسیەتو تایبەتێتی ئەو جێناوەدا نەچوون •

لە مەسەلەی جێناوی چەندێتیدا سێ شت لە باسە ڕێزمانییەکاندا بەدی دەکرێ :

١ ـ زوربەی نووسەران نە باسیانکردووەو نە بەلایدا چوون • دیارە ئەمەش لە دوو ڕێگەوە وا کەوتۆتەوە • یەکەم ـ بەشێك لەو نووسەرانە لەبەر کورتیی نووسینەکانیان یان هەستپێنەکردن بەلایدا نەچوون ؛ دووەم ـ بەشێکی تریان لەبەر ئەوەی بە جێناویان دانەناوە یان ئەگەر بە جێناویشیان دانابێ ، وەك جێناوی چەندێتی تەماشایان کردووە •

٢ ـ کەمێ لە نووسەران ئەگەرچی باسیانکردووە ، بەلام وایانداناوە ، کە ئەم گرووپە جێناو نییەو پێوەندی بە ناوو ئاوەڵکردارەوە هەیە •

٣ ـ ئەو نووسەرانەش کە وەك گرووپێکی تایبەتی جیایان کردووەتەوەو لێیدواون ، زوربەی زۆریان بە چەند دێڕێك کۆتاییان بەو باسە هێناوە • وێڕای ئەوە . ئەوانەش کە لەم باسەدا سەرکەوتوون ، گەلێ وشەی ئاشکرای ئەم گرووپەیان ناونەبردووە •

هیچ یەکێك لە نووسەرانی لای خۆمان باسی ( جێناوی هاوبەشی )ی نەکردووە • سەرەڕای ئەوەش ، هەندێکیان بە تەئسیری زمانیئینگلیزی گرووپی ( جێناوی لێکدەر )یان هێناوەتە ناوەوە •

ئەمانەو گەلێك کێشەو نائاشکرایی دی لە باسی جێناودا دەبینرێن • جا هیوامە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا توانیبێتم بەشێکی زۆریان ساغبکەمەوە •

جێناو لەنێو بەشە ئاخاوتنەکانی دیدا جێگایەکی دیارو تایبەتی هەیە ، ئەگەرچی لە ڕووی واتاو پێوەندییەوە لە ناوو ئاوەڵناوو ژمارەو هەروەها ئاوەڵکردار نزیکە ، بەڵام گرووپێکی سەربەخۆیە • لە لایەنی واتاوە جێناو خاسیەتی ئەوەیە کە وا جێگەی پێوەندیی واتای گشتیی نێوان ئەو شتانە دەکاتەوە کە لە واقیعی جیهاندا هەن •

بەر لە هەر شت تایبەتێتی واتای جێناو لەوەدایە ، کە وا نەك تەنیـــا واتای کەس‌و شت‌و چۆنیەتی‌و چەندێتی نیشان‌دەدا ، بەڵکو پێوەندییان لەگەڵ کەس‌و شت‌و چۆنیەتی‌و چەندێتی تریشدا ڕادەگەیەنێ‌و خاسیەتیان لە ڕووی ئەو پێوەندییەوە دیاری دەکا • بەوێنە جێناوی ( تۆ ) لە ڕستەی : « تۆ کتێبەکەم بۆ بێنەوە »دا ، کەســـێك ڕادەگەیەنێ کە پێوەندی بە قسەکەرەوە هەبێ • لە ڕاستیدا ئەوە نیشـــان دەدا کە ئەو کەســــە قسەبۆکراوەو وەك بەشداری‌کەری قسەکردنەکە دێتە ناوانەوەو قسەکەر ڕاستەوخۆ لەگەڵی دەدوێ •

ئەگەر بێینو لەو هەواڵە وردبینەوە کە وا باسی ( ٢٥ ) قوتابی دەکاو دەڵێ : « دوێنێ ( ٢٥ ) قوتابی بەشـــــداریی یاری‌یان کرد ، هەموویان خەڵات‌کران » ، ئەوە لە حاڵەتی یەکەمدا ژمارەی بەشـــــداری‌کەران لە یاری‌دا وتراوە ، بێ ئەوەی پێوەندی نێوانیـــان نیشـــان‌بدرێ • بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا جێناوی ( هەموو ) نیشانی پێوەندیی ژمارەی بەشداران بە ژمارەی خەڵات‌کراوانەوە دەدات‌و ئەوە ڕادەگەیەنێ کە بەشـــــداران تێکڕایان خەڵات‌کراون ••• لە شێوەیەکی وێکچووی ڕستەی « دوێنـــێ ( ٢٥ ) قوتابی بەشــــداریی یاری‌یان‌کرد ، هەندێکیان خەڵات‌کران »دا دەربڕینی پێوەندیی ژمارەی خەڵات‌کراوان بە ژمارەی گشتیی بەشدارانەوە

بەدیدەکرێ . ئەویش وەك بەشـێکی نادیاری بەشـداران لە سـەرپاکی بەشداران ... جێناوی ( کەس ) لە ڕستەی : « من لە سۆلاف کەسـی ناسیاوم نەبینی »دا دیسان ئەوە دەگەیەنێ ، کە وا لە کاتی بوونمدا لـە سۆلاف کەسێکی ناسیاوم نەبینیوەو ئەو ( کەس )ەش هەموو ناسیاوێك دەگەیەنێ .

بەو جۆرە جێناو واتای کەس‌و شت‌و چۆنیەتی‌و چەندێتی دەگەیەنێ لەسـەر بناغەی هەر پێوەندییەك بێت . دیارە ئەو پێوەندییانەش بەپێی حاڵەتی پێویست پەیدادەبن‌و دەگۆڕێن . خاسـیەتێکی تری جێناو بەم تایبەتێتی‌یەوە بەندە ـ ئەو تایبەتێتی‌یەش ڕاگەیاندنی کەس‌و شت‌و چۆنیەتی‌و چەندێتی دیارو دیاری‌کراوە . ئەوەتە تەنانەت لـە گفتوگۆیەکدا جێناوی ( تۆ ) هەر یەکێ لە بەشدارانی گفتوگۆکە دەگرێتەوە ، کە ڕووی قسـەی لێ‌بکرێ ، کەچی لە هەموو بارێکی ئاخاوتندا ئەم جێناوە دەتوانێ کەسانی جیاوازی دیارو دیاری‌کراو بگەیەنێ ، کـە هاوبەشیی گفتوگۆکەت بن . جێناوی ( ئەوەندە ) دەتوانێ چەندێتی هەمەچەشن ڕابگەیەنێ ، تەنانەت شتی دژواتاش : « دوێنێ ڕۆژێکی گەرم بوو ، ئەمڕۆش ئەوەندە گەرمە » ؛ « دوێنێ ڕۆژێکی سارد بوو ، ئەمڕۆش ئەوەندە ساردە » . لە ڕسـتەی یەکەمدا واتـای دیـارو دیاری‌کـراوی جێناوەکە ڕاگەیاندنـی ڕادەی ( گەرما )یە . لە ڕستەی دووەمدا دژواتایەتی ، کە ( سەرما )یە ... جێناوی ( هەموو ) لـە حاڵەتی جۆربەجۆردا ژمارەی جیاواز دەگەیەنێ . بەوێنە : « برایان هەموو لە ماڵن » ؛ « هەموو گەلی کورد ڕاپەڕیوە » ... جێناوی ( خۆ ) لە ڕستەی : « کوڕەکە ئێمەی بۆ ماڵی خۆیان بانگ‌کرد ، کچەش بۆ ماڵی خۆیان » . حاڵەتی یەکەم « ماڵی کوڕە » دەگەیەنێ ؛ بەڵام حاڵەتی دووەم « ماڵی کچە » ... بەمەدا ، وەك نموونەکان نیشانی دەدەن ، واتای دیاری‌کراوی جێناو لە ڕێی بارو دۆخی یاریدەدەری هەمەچەشنەی وەك : جۆری تێکست ؛ حاڵەت ؛ پێوەندی نێوان بەشدارانی ئاخاوتن ؛ هەواڵی

جۆراوجۆر ••• ەود ئاشـــکرا دەبێ • بێ کارتێکردنی ئەو دەوروبەرەی واتای دیاری جێناوەکە ئاشکرا نابێ • بەوێنە ئەگەر لە تێکســــتێکدا ڕستەی « ئەو زوو بیری کەوتەوە ، کە دوێنێ چی بڕیاردابوو » وەربگرین ، ئەوە ئاشکرا نییە کەسی جێناوی ( ئەو ) کێیە ، بەڵام ئەگەر ڕســـــتەی پێشەوەی « دارا لەپڕ خەبەری بووەوە » بڵێین ، ئەوە جێناوی ( ئەو ) بەتەواوی واتای دیاری خۆی دەدا •

ئەم جۆرە گۆڕانەی واتای جێناو بەندە بە بارو دۆخو تێکستەوەو لەمەدا بەرانبەر ناوو ئاوەڵناوو ژمارە دەوەستێ ، کە سەربەخۆیی‌و واتای چەسپاویان هەیە • ناوو ئاوەڵناوو ژمارە کەس‌و شت‌و چۆنیەتی‌و چەندێتی ناودەبەن ، بەڵام جێناو تەنیا ئیشارەتیان بۆ دەکا • زۆر جار لە پرسیاری لە کوێوە هاتنـــی زاراوەی « جێناو »ەوە دەوترێ لە « جێگری ناو »ەوە هاتووە ، چونکە پاڵپشتی واتای دیاری جێناو ناو یان ئاوەڵناوەو لـــــەم لایەنەوە جێیان دەگرێتەوە : « ئازاد لەسەر گردێك دانیشـــــتبوو • ئەو ( = ئازاد ) لە دوورەوە دیاربوو » ؛ « پێی ناوێ بۆ شـــەهیدی وەتەن شیوەن‌و گرین ـ نامرن ئەوانە ( = شەهیدی وەتەن ) وا لە دڵی میللەتا ئەژین » ••• بەڵام تەنانەت لەگەڵ ئەو واتای ( جێگر )ی‌یەی جێناویشدا ، جیاوازیی زۆری لەگەڵ واتای ناو یان ئاوەڵناوە ( جێ‌گیراو )ەکەدا هەیە ، بەتایبەتی لەوەدا کە جێناو بەندە بـــەم یـــان بەو ناو یان ئاوەڵناوەوەو لە ڕووداوی جیاوازدا بەکارهێنانی دەبێتە هـــۆی گۆڕینی ناوەرۆکی دیارو دیاری‌کراو • لەپاڵ ئەوەشدا واتای جێناو وەنەبێ هەمیشە لە واتای ناو یان ئاوەڵناو بچێ ، بەڵکو زۆر جار بە خاســـــیەتی جیاوازی خۆی دەبینرێ‌و لەنێو ( ناو )دا وشە نییە وەك واتای ئەوی هەبێ • بۆ نموونە هیچ ناوێك ناتوانێ واتـــای جێناوی ( من ، تۆ ) بگەیەنێ ، کە وا لەســــــەر بناغەی بەشداریی لە گفتوگۆدا ئیشارەت بۆ کەس دەکەن • لەنێو ناوو ئاوەڵناودا هیچ وشەیەك نییە بەرانبەر جێناوی ( کێ ) یان ( چۆن ) یان ( هەموو ) یان ( کەس ) ••• بووەستێ •

جێناو به ژماره گرووپێکی بچووکه ، بەلام له ئاخاوتندا ئەرکێکی گەلێ گرنگ‌و گەوره دەبینێ‌و لەبەر ئەوه زۆر بەکاردەهێنرێ • له زۆریی بەکارهێنانیدا جێناو لەنێو وشەکانی بەشـــه ئاخاوتنەکانی زماندا له پلەی یەکەمدا دێت • ئەو زۆر بەکارهێنانەشـی به تایبەتێتی زۆری ڕێزمانیی‌یەوه بەستراوه •

جێناو له ڕووی واتاوه دابەش دەبێ بەسەر چەند جۆرێکدا ئـــەو جۆرانه له ڕووی خاســـیەتی ئەوپێوەندییەوه جیادەبنەوه که وا هەندێ گرووپی جێناو دەیگەیەنن • ئەو دابەش‌کردنه دەمێکه له لایەن زانـایـانی ڕێزمانەوه کراوه‌و نووسەرانی کوردیش کەلکیان لێ‌وەرگرتووه •

وەك له فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەدا لێی‌دواوین ؛ لەنێو نووســەرانی ڕێزمانی کوردیدا له دیاری‌کردنی جۆرەکانی جێناودا شـــێوەی جیاواز دەبینرێ ••• بەپێی بۆچوونی ئێمه لـــه زمانی کوردیدا له ڕووی واتاوه دەشێ جێناو بەسەر ئەو چەند جۆرەی خوارەودا دابەش‌بکرێ :

**١- جێناوی کەسی :**

**ا - جێناوی کەسیی جودا •**

**ب - جێناوی کەسیی لکاو •**

**٢ - جێناوی خۆیی**

**٣ - جێناوی نیشانه**

**٤ - جێناوی پرسیار**

**٥ - جێناوی چەندێتی**

**٦ - جێناوی هەیی**

**٧ - جێناوی نەفی**

**٨ - جێناوی هاوبەشی**

**٩ - جێناوی دیـار**

**١٠- جێناوی نادیـار**

# جێناوی کەسیی جودا

لـــە دیـالێکتی کرمـانجیی ژووروودا دوو دەســــــتە جێنـاوی کـەسـیی جـودا هـەیـە ، کـــە ئەوانیش بـەپێی دۆخی ڕاســـــتەوخۆ (Direct case) و دۆخی تیان (Oblique case) دابەشدەبن :

| ژمارە | کەس | دۆخی ڕاستەوخۆ | دۆخی تیان |
|---|---|---|---|
| تـاك | یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | ئـەز<br>تـو<br>ئـەو | مـن<br>تـە<br>ئەوێ ، وێ ( بۆ مێ )<br>ئەوی ، وی ( بۆ نێر ) |
| کـۆ | یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | ئـەم<br>هوون<br>ئەو ، ئەوان | مـە<br>وە<br>ئەوان ، وان |

نموونە بۆ جێناوەکانی دۆخی ڕاستەوخۆ :

( ئەز ) ـ کەسی یەکەمی تاك .

ئـەز بەندە نـە لایقێ ویصـــــالم
خورســـەندێ ب صـــوورەتێ خیالم

( خانی ، ل ١٦٢ )

( تو ) ـ کەسی دووەمی تاك .

رازێ دەهرێ ژ سپەهرێ تـو نزانی ب جەدەل
حکمەتێ داوەرە تو ژ حکمەتێ داوەر مەکە بەحث

( جزیری ، ل ١٥٨ )

( ئەو ) ـ کەسی سێیەمی تاك •

**ئــەو شـــاهە ، ئەگەر چ ئــەز گەدامە**
**ئەلطافێ شـــەهەنشـــەهانە عـامــە**

( خانی ، ل ١٦٢ )

( ئەم ) ـ کەسی یەکەمی کۆ •

**دگۆتن : گەلی برانــۆ ، ئــەم سێ برانــە •**

( مەمێ ئالان ، ل ٣٩ )

( هەون ) ـ کەسی دووەمی کۆ •

**هوون نــە گوناهکارن ، ئەم ب خوە هاتن جەم وە •**

( کوردۆ ، ل ١٢٨ )

**مەمێ گۆت : ئــەز ژ وە دخوازم هوون تــەڤ چێکن تــەخمەکی ژ بۆنا بۆزێ رەوانە •**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٤ )

( ئەو ، ئەوان ) ـ کەسی سێیەمی کۆ •

**ئــەو هــەردو جوان ، وەلێــکی عاشــق**
**ئــەو هــەردو بــرا ، وە پێکڤە صـــادق**

( خانی ، ل ٩٦ )

**نــوورەك فتــلی ل وان ژ نــاگــــەهـ**
**ئێــدی ڤــە نــە ما ئەوان چو ئاگــەهـ**

( خانی ، ل ١٢٤ )

نموونە بۆ جێناوەکانی دۆخی تیان :

( من ) ـ کەسی یەکەمی تاك

**دلێ مــن گەش‌کر ڤێ جڤــانــا وە •**

( صەبری ، ل ٢٣ )

( ته ) ـ کەسی دووەمی تاك •

**... « بێژه ، چ دەخوەزی ئەزێ پێشکێش بدمه تـه ، قەرارێ من هەیە ، ئەز تشتەکی ببەخشیمه ته » .**

( کوردۆ ، ل ٤١ )

( ئەوێ ، وێ ) ـ کەسی سێیەمی تاکی مێ •

**... ئـەوێ دگۆت : « ژ منڕا شەعرو شەمەقیا بینه ، کراسێ هەوریشمێ بینه ! » .**

( کوردۆ ، ل ٣٣ ـ ٣٤ )

**یـا دن ، بـاڤێ وێ مەزنێ جزرا بۆتانـه**
**کەچـا میـر زەنگین ، زینـا زێـدانـه**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٥ )

( ئەوی ، وی ) ـ کەسی سێیەمی تاکی نێر •

**ئەوی قرارکر ، کو ژنا خوەڕا تلی نەکە .**

( کوردۆ ، ل ٤٥ )

**... هنەك دبێژن : « ئەمێ ناڤێ وی بکن عارف » .**

( مەمێ ئالان ، ل ٤١ )

( مه ) ـ کەسی یەکەمی کۆ •

**مالێ مـه ، عەردێ مـه ، خەباتا مـه تەڤی جان ...**

( صەبری ، ل ٢٥ )

( وه ) ـ کەسی دووەمی کۆ •

**ل پێش وه دبن ئەم دۆزەك پڕ گران**

( صەبری ، ل ٢٣ )

( ئەوان ، وان ) ـ کەسی سێیەمی کۆ •

**سـەرحەلقەیێ وان پـەری میسـالان**
**سـەرتاجێ ئەوان مەلـەك خیصـالان**

( خانی ، ل ٩٦ )

ئەو فۆرمانەی جێناوی کەسیی جودا کە خستمانە پێش‌چاو ، ئەوانەن کە لە ئاخاوتنی کرمانجی ژووروو و ئەدەبیات‌و فۆلکلۆریدا زۆر لە کاردان . ئەگینا لە هەندێ بەشە دیالێـــکتی ژووروودا بۆ بەشـــێك لەو جێنـــاوانە فۆرمی دی بەکاردێن .

لە بادینان جێناوی کەسیی جـودا ، هەر ئەوانـەن کە لـە بەشـــە دیالێکتەکانی‌تری دیالێکتی ژووروودا هەن ، بەڵام لە کۆمەڵی ئەم جێناوانەدا هەندێ گۆڕانی فۆنەتیکی هەیە ، کە بەشە دیالێکتێك لە بەشە دیالێکتێکی‌تر جیادەکاتەوە . جیاوازی لە نێوان بەشە دیالێکتەکانی بادیناندا لە سەرێکەوەو لەنێوان بەشــە دیالێکتــەکانی تری دیالێــکتی ژووروو و بادینـــاندا لـــە سەرێکی‌ترەوە ، بە شێوەیەکی سەرەکی لە فۆرمی کەسی دووەمی تـــاك‌و کۆدایـــە :

جێناوی کەسیی جودا لە بەشە دیالێکتەکانی بادیناندا[١]

---

(١) لە ڕێك‌خستنی ئەم نەخشـەیـــەدا جگە لـــە تـــەجروبەو زانینی خۆم ، هەروەها کەڵکم لە کارەکانی : د. مەکســـــیمی خەمۆ ، د. مەکەنزی وەرگرتووە ... لە بەراوردکردنی ئەو دوو نەخشـەیەدا دەبینین :

١ ـ لە ناوچەی ئاکری .

أ ـ لە دۆخی ڕاستەوخۆدا بە تەواوی یەك‌دەگرنەوە .

ب ـ لە دۆخی تیاندا بۆ کەسی یەکەم‌و دووەمی تاك‌و کەسی یەکەمی کۆ د. مەکـەنزی جگە لـــە ( من ) و ( تـــە ) و ( مە ) ، هەروەهـــا ( ئەمن ) و ( ئەتە ) و ( ئەمە )شی نووسیوە . بـــۆ کەسی دووەمی کۆ د. مەکسیمی خەمۆ ( هونگە )ی داناوە ، بەڵام د. مەکەنزی ( هۆنگۆ )ی نووسیوە .

٢ ـ لە ناوچەی ئامێدی .

أ ـ لە دۆخی ڕاستەوخۆدا هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە .

ب ـ لە دۆخی تیاندا بۆ کەسی یەکەمی تاك د. مەکسیمی خەمۆ هـــەر ( من )ی نووسیوە ، هەرچی د. مەکەنزی‌یە ، جگە لەو فۆرمـــە ( م )شی تۆمارکردووە .

... و هەندێکی‌تر .

| ژمارە | کەس | ئاکری | ئامێدی | زاخۆ | شێخان | ئەترووش | بامەڕنی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **دۆخی ڕاستەوخۆ** | | | | | | | |
| تـاك | یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | ئەز<br>ئە ( تۆ )<br>ئەو | ئەز<br>تۆ<br>ئەو | ئەز<br>تـۆ<br>ئەو | ئەز<br>تو<br>ئەو | ئەز<br>تـۆ<br>ئەو | ئەز<br>توو<br>ئەو |
| کـۆ | یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | ئەم<br>هونگ<br>ئەو ( ان ) | هونگ<br>ئەو( ان ) | ئەم<br>هوون<br>ئەو( ان ) | ئەم<br>هوون<br>ئەو( ان ) | ئەم<br>هونك<br>ئەو( ان ) | ئەم<br>هین<br>ئەو( ان ) |
| **دۆخی تیـان** | | | | | | | |
| تـاك | یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | من<br>تـە<br>ئە( وی ) | من<br>تـە<br>ئە( وی ) | من<br>تـە<br>ئە(وی) | من<br>تـە<br>ئە(وی) | من<br>تـە<br>ئە(وی) | من<br>تـە<br>ئە(وی) |
| کـۆ | یەکەم<br>دووەم<br>سێیەم | مە<br>هونگە<br>ئەو( ان ) | مە<br>وە/هەوە<br>ئەوان | مە<br>وە<br>ئەوان | مە<br>وە<br>ئە( وان ) | مە<br>هونکە<br>ئە(وان) | مە<br>هەوە<br>ئە(وان) |

له بەراورددا دیارە ، کە وا فۆرمی ڕاستەوخۆی کەسی دووەمی کۆی جێناوی کەسیی جودا لە بامەڕنی (هین)ە و لە ئەترووش (هونك)ە • فۆرمی نیانی کەسی دووەمی کۆی جێناوی کەسیی جودا لە بامەڕنی (هەوە)یە و لە ئەتروش ( هونکە )یە •

جیاوازیی ئەو بەشە دیالێکتانە لەگەڵ بەشە دیالێکتەکانی بامەڕنی و ئەترووش لە دۆخی ڕاستەوخۆ و تیاندا ئەوەیە کە کەسی سێیەمی کۆی جێناوی جودا لە زمانی ئەدەبیو بەشە دیالێکتی کوردانی شێخاندا لە فۆرمی (هوون) ، (وە) دایە ؛ لە ئاخاوتنی کوردی ئامێدیدا ـ (هنگ) ، (وە) ؛ لە ئاخاوتنی کوردی ئاکریدا ـ ( هونگ ) ، ( هونگە )یە •

جگە لەوە ، فۆرمی کەسی دووەمی تاك لە بامەڕنیو شێخان وێكدەچن • ئەم فۆرمە لە ئەترووشو ئامێدی یەكدەگرنەوە • لە حاڵەتەکانی تردا جێناوی کەسیی جودا لە بەشە دیالێکتەکاندا وەك یەکن[٢] •

له شێوەی کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتدا ، هەروەها وەك هەموو کرمانجیی ژووروو بەپێی دۆخ دوو گرووپی جیاواز هەیەو فۆرمی جێناوەکانیش لە زمانی ئەدەبییاندا ، بەتەواوی لەگەڵ شێوەی گشتیی ئەدەبی کرمانجیی ژووروودا یەكدەگرنەوە • واتە :

بۆ دۆخی ڕاستەوخۆ : ئەز ، تو ، ئەو ، ئەو ، هوون ، ئەو / ئەوان •

بۆ دۆخی تیان : من ، تە ، وی / ئەوی ـ وێ / ئەوێ ، مە ، وە ، وان / ئەوان •

بۆ کەسی سێیەمی کۆ ، جگە لەوانەی لەسەرەوە ناومانبردنو کە گشتین بۆ هەموو شێوەکانی کوردی سۆڤێت ، هەروەها لە بەشە دیالێکی

(٢) بڕوانە : د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی « وڵاتانو میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیكو ناوەڕاست » ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٢٧٣ ــ ٢٨٢ •

ئازربایجاندا ناوناوە بۆ کەسی سێیەمی کۆ ئەم فۆرمانەش : (ئیدە ، ئەدە ، ئینە) دەبینرێن ، وەك :

**خزان چوون مەکتەبە ، ئیدە هو دبن**
**کۆ ڕادبن ئەدە هەرن تاداش دمبە ...**
**فان کۆلخۆزچیریە مە ، ئینە تووتوونە نەرمف دکن .**

لە هەندێ بەشە دیالێکتی کوردەکانی سۆڤێتدا دووپاتکردنەوەی نیشانەی ( ان ) بەرچاودەکەوێ : ئەو + ان + ان . بۆ سەر ئەم فۆرمە ئالۆزە دەشێ هەروەها نیشانەی ( ا )ش ئیزافە بکرێ . لە نەڵ ئەوەشدا ئەم فۆرمە درێژە لەڕووی واتاوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ فۆرمی عادەتی «ئەوان ( ا ) » و «وان ( ا ) »دا نییە . بە وێنە :

**تو فام دەکی ئەواتان چ گەپ دەکن ؟**
**تە بیست ئەوانانا چ گۆ ؟**(۳)

**چەند سەرنجێك :**

* جێناوی ( من ) هەندێ جار دەنگی (ن)ی کۆتاییەکەی قووت دەدرێ و دەوترێ :

**ظاهر تو پەریشانی حالی م نەبین**
**مەجموعی د ذاتێ خومو طوغرایم ئەز**
**( جزیری ، ل ۲۱۷ )**

* جێناوی کەسی جودا لەڕووی جنسەوە جیاوازی لە نێوانیاندا نییە ، جگە لە حاڵەتی کەسی سێیەمی تاك کە لە دۆخی تیاندا دوو فۆرمی جنسیهەیە : ئە (وێ) ـ بۆ مێ ؛ ئە (وی) ـ بۆ نێر .

فۆرمی ئە (وێ) و ئە (وی) دۆخی تیان لە بناغەی (ئەو) و (ێ)ی نیشانەی جنسی مێو (ی) نیشانەی جنسی نێر سازبووە .

---

(۳) د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۳ ، ل ۱٤۰ .

* هەر هەمان بناغەی (ئەو) بە یارمەتی نیشانەی (ان)ی کۆ کەسی سێیەمی کۆی جێناوی کەسیی جودای ڕۆناوە •

* کاتێ نیشانەی (ێ) یان (ی) یان (ان) دەچێنە سەر (ئەو) ، ئەو دەم (ئە)ی سەرەتا دەکرێ بقرتێ یان بووترێ •

* هەندێ جار لە بریتی ( ئەوان )ی فۆرمی تەواوی دۆخی ڕاستەوخۆی جێناوی کەسی سێیەمی کۆی جێناوی کەسیی جودا فۆرمی (ئەو)ی ناتەواو بەکاردێنرێ ، کە لەگەڵ (ئەو)ی جێناوی کەسی سێیەمی تاکدا دەبێتە هاوبێژ (Homonym) • لەم حالەتەدا واتای ژمارە لە تێکستدا ، لەڕێی گەردانی کردارەکەوە یان هەندێ زیادییەوە بەدەردەکەوێ • بەوێنە :

**ئەو چوو / ئەو چوون •**
**ئەو برە منە / ئەو برە منن •**

* جێناوی کەسیی جودای دۆخی ڕاستەوخۆ نیشانەی ( ە ) و ( ی ـ î ) وەردەگرێ • لە حالەتی تاکدا بۆ سازبوونی جنسی مێ نیشانەی ( ە )و بۆ جنسی نێر نیشانەی ( ی ـ î ) بەکاردێنرێ • لەگەڵ جێناوی کەسیی جودای کۆدا نیشانەی ( ە ) بەکاردێ ، وەك :

| تاك | | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|
| کەس | مێ | نێر | کەس | نێرو مێ |
| یەکەم | ئەزە | ئەزی | یەکەم | ئەمە |
| دووەم | تۆە | تۆی | دووەم | هوونە |
| سێیەم | ئەوە | ئەوی | سێیەم | ئەوانە |

* جێناوی کەسیی جودا ، کە لەگەڵ کرداری کاتی ڕابوردوو و ئایندەی ڕێژەی ئیخباریدا یان ئایندەی ڕێژەی ئینشائیدا دێت ، نیشانەی (ێ) وەردەگرێ •

**... گۆت : « چەند ڕۆژا شووندا ئەزێ ژ تەرا بێژم » •**
**( کوردۆ ، ل ٤٥ )**

ئەزێ هەرِم ناڤ وان ژ خوەرِا یەکە رند بێژم ...

( کوردۆ ، ل ٤٣ )

... ئەزێ بانکم جیریێو خولامانە .

( مەمێ ئالان ، ل ٤٩ )

... ئەزێ رِابم ، بانکم هەزارو پێنج سەد خورتێن مەزنێن کوردانە

( مەمێ ئالان ، ل ٥١ )

... توێ بزانبی چ کارا تـە وی هەیە ...

( کوردۆ ، ل ٣٩ )

... هتد .

له دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، لەگەڵ ئەوەشدا کە سنوورێکی تەواو لەنێوان دۆخی ڕاستەوخۆو دۆخی تیاندا هەیە . بەڵام ئەوەش بەدیدەکرێ کە فۆرمی دۆخی تیان بە فۆرمی ڕاستەوخۆ دەربڕراوە ، یان بەپێچەوانەوە فۆرمی دۆخی ڕاستەوخۆ لەبریتی فۆرمی دۆخی تیان بەکارهێنراوە[٤] .

★ ★ ★

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا یەك دەستە جێناوی کەسیی جودا هەیە پێوەندی بە دۆخەوە نییە .

لە ئاخاوتنی ئەمڕۆی سلێمانیو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیدا جێناوەکانی کەسیی جودا ، ئەمانەن :

---

(٤) باسی ئەو تێکەڵ کردنە لەو شوێنەدا دەکەین ، کە دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی جێناوی کەسیی جودا دەدوێین .

| ژماره | کەس | جێناو |
|---|---|---|
| تاك | یەکەم | من |
| | دووەم | تـۆ |
| | سێیەم | ئەو |
| کـۆ | یەکەم | ئێمە |
| | دووەم | ئێوە |
| | سێیەم | ئەوان |

**نموونـە :**

من ـ کەسی یەکەمی تاك •

**بۆچی بوختـان کـەم کە شەیتانە گوناهم پێ ئەکا**
**من چە شەیتانم نییە هەر نەفسمە شەیتانی خۆم**

( زێوەر ، ل ٣٣ )

تۆ ـ کەسی دووەمی تاك •

**نە لـە شارو نـە لـە دێ**
**نـەمدی کـەس**
**وەك تـۆ جوان بێ**
**تۆیتو بەس**

( گۆران ، ب ، ل ٣٥ )

ئەو ـ کەسی سێیەمی تاك •

**ئـەو شتی وای بۆ چییە ، با بە بێ پارە ئەوە بدا بە من •**

( لەخەوما ، ل ٤٥ )

ئێمە ـ کەسی یەکەمی کۆ •

**کێ قەدری شیعری ئێمە دەزانێ ، بەری دەکا**
**هـەر صـاحێبە لەبەرکەری کالای بێ ڕەواج**

( مەحوی ، ل ٩٣ )

ئێوه ـ کەسی دووەمی کۆ •

**ئەمجا بـاوك ڕووی تێ کـردن**
**وتی ڕۆلــه گــوێ‌بگـــرن**
**ئێوەیش ئەگـەر لــەم ژیـانـه**
**جیــابـــن وەك ئـەم دارانــه**
**شـــكاندنتان زۆر ئاســـانـــه**

( بێکەس ، ل ١٩٢ )

ئەوان ـ کەسی سێیەمی کۆ •

**ڕێم نیه منیش شــوێن ئەوان کەوم**
**پیـرم هەنگاوێـك بنێم نـەكـەوم**

ئەگەر ئاوڕێك لە زووی ئەم شێوەیە بدەینەوە ، دەبینین :

١ ـ بۆ کەسی یەکەمی تـاك جگە لە ( من ) هـەروەها ( ئەز )یش بەکارهێنراوە • هەرچەندە ئەوەی لەم بارەیەوە مامۆستا تۆفیق وەهبی کـە وتوویە : « میستەر ڕیچ لە ساڵی ١٨٢٠دا لە سلێمانی گۆرانییێکی بیستووە کە تێیدا ڕستەی ( ئەز دەناڵم ) هەبووە »[٥] و ئەوەی د• قەناتی کوردۆ ، کە نووسیویە : « لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا بە شایەتی ئا• خۆدسکۆ بۆ کەسی یەکەمی تاك ، جگە لە (من) هەروەها (ئەز)یش دەبینرێ»[٦] نموونەی باشن ، بەڵام بەڵگەی نێزیکترو واقیعی‌تر زۆرە ، ئەویش ئەوەیە ، کە ئەو دیاردەیە لە هەندێ پەندی پێشــینان‌و شـــیعری هەندێ لە شـــاعیرانی کلاسیکی‌دا بەرچاو دەکەوێ •

---

(٥) تۆفیق وەهبی ، ئەسلی پیتە قالبی ( ئە )ی شێوەی ســـلێمانی ، « گۆڤـــاری کۆڕی زانیـــاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغـــدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٥ .

(٦) د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، دەســـــتووری زمـــانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆســـکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٠٤ .

بـۆ نموونه :

ئـەمزم ، هەڵئەبەزم .

( پەندی پێشینان ، ل ٢٧ )

ئەگەر زانی ئەمزم ، ئەگەر نەیزانی دزم .

( پەندی پێشینان ، ل ٣٢ )

ئەوه ئەمزم ، هەڵ ئەبەزم .

( پەندی پێشینان ، ل ٥٩ )

بەهاران حەیوانۆ بەز ، هاوینان باخۆ ڕەز ، زستانان ئاگرو ئەز

( پەندی پێشینان ، ل ١٢٥ )

خـاوو بێخـــاوی دو زولفی خـاوم ئـەمز
چـاوه چـاوی یـەك غەزالـه چـاوم ئـەمز
گـەر نییه ئـاور لـه ســـــینەمدا بەتاو
بـۆچ لەبـەر قولقوڵ غـەریقی ئاوم ئـەمز ؟!
نـاری ســـــینەم گــەر نەبێ غەرقم ئەمن
ئـاوی چاوم گـەر نەبێ ، ســووتاوم ئـەمز
غەیری زوڵفی تـۆ کـه ڕشـــــتەی عومرمه
دەس لــه ( ما فیها )ی زەمان بڕیاوم ئـەمز
تـازه ئەبـڕۆت وسمه کێشـــــاوه بـه نـاز
دڵ لـەتی شمشێری تازەســـــاوم ئـەمز
ئەی ڕەفیقان ! صـوحبەتی « نالی » مەکـەن
بـۆچ ؟ کـه من لەوڕا وەکـو بەدناوم ئـەمز

( نالی ، ل ٢٢١ – ٢٢٣ )

٢ – وێرای فۆرمی (من) و (تـۆ) ، هەروەها (ئەمن) و (ئەتۆ)ش هەبووه . بەوێنه :

چەندە پێم خۆشبوو زوبـانی حاڵی دەیوت « نالیا »
هەردو حەیوانین ، ئەتۆ گوێکورتۆ ئەمنیش گوێدرێژ

( نالی ، ل ٢٢٨ )

**هیلاکی دەستی حەناییتە ، کوشتە بێ دەمی تێـغ ،**
**ئەمن شــــکاریی پابەســـتەوو ، ئەتـۆ با دەســـت**
( مەحوی ، ل ٧١ )

**دەرحــەق بــە عیلم و مەکتــەب ئەتۆ هاتیتە زبـان**
**فکری بلنـــدی تـۆیـە گەیشـــتۆتە موشـــتەری**
( زێوەر ، ل ٢٣ )

ئەگەر بۆ دەستنیشـانکردنو ڕوونکردنەوەی پلەکانو کەمبوونو نەمانی فۆرمی ( ئەمن ، ئەتۆ ) ، گەشتێك بە دیوانی شاعیرانی کۆنو نوێی ناوچەی سلێمانیدا بکەین ، ئـەوە دەبینین کە لـە زوودا ئـەو فۆرمە زۆر بەکارهاتووەو دوایی کەمبۆتەوەو ئنجا تێداچووە • بەوێنە لە شیعرەکانی نالیو سەردەمی ئەودا وێنەی ( ئەمن ، ئەتۆ ) زۆر دەبینرێ ••• بەلام ئەگەر بەرەوپێش بێین ، ئەوە دەتوانین ڕەوتی ئـەو دیاردەیە دیاری بکەین • بۆ نموونە لە شیعرەکانی مەحویدا هەرچەندە (ئەمن ، ئەتۆ) زۆر بەکارهاتووە، بەلام لەوی نالی کەمترە • زێوەر کە ماوەیەك بەدوا مەحویدا هاتووە ، زۆر ( ئەمن ، ئەتۆ )ی نەوتووە • بێکەس کە کەمێك پاش زێوەر کەوتووە تەنیا لە دووسێ شوێندا ( ئەمن . ئەتۆ )ی نووسیوە ••• لە بەرهەمی شاعیرانی دواتردا بە هیچ چەشنێك ئەو فۆرمە نابینرێ •

لە ئاخاوتن و فۆلکلۆری بەشە دیالێکتی موکریدا جێناوی کەسی جودا، بە شێوەیەکی ســەرەکی دوو فۆرمی هەیــە • یەکێکیان بە ( ئە ) دەسـت پێ دەکات و ئەویتریان بە بێ ( ئە ) • بوونی ئەو دوو فۆرمەش لەو بەشە دیالێکتەدا پێوەندی بە دۆخەوە نییە :

| ژماره | کەس | سەرەتا بە (ئە) | سەرەتا بە بێ (ئە) |
| --- | --- | --- | --- |
| تـاك | یەکەم | ئەمن | من |
| | دووەم | ئەتۆ ، ئەتوو | تۆ ، توو |
| | سێیەم | ئەو | وی |
| کـۆ | یەکەم | ئەمە | مـە |
| | دووەم | ئەنگۆ | نگۆ |
| | سێیەم | ئەوان | وان |

نموونە بۆ ئەو جێناوانەی بە ( ئە ) دەستپێدەکەن :

ئەمن ـ کەسی یەکەمی تاك .

**شاەعەبباس گوتی : « دەروێش ئەمن بنێرە لە جیاتی خۆت » .**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۸۰ )

ئەتۆ / ئەتوو ـ کەسی دووەمی تاك .

**خانەخوێ گوتی : « دەروێش ئەتـۆ بۆ ناڕوێ ؟ »**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۸۵ )

**... ئەتوو خەرجی ئەمشۆت لەکوێ بوو ؟**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۸٦ )

ئەو ـ کەسی سێیەمی تاك .

**... هەرچی ئەو دەڵێ وام بەسەردێ .**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۸۸ )

ئەمە ـ کەسی یەکەمی کـۆ .

**کاکەمەمو بەنگینە گوتیان : « مامۆستا خولا هاتۆتە نێو ئەمە » .**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲۲۳ )

ئەنگۆ ـ کەسی دووەمی کـۆ •

**سەگ گوتی : « ئەنگۆ دەنگێ مەکەن ، ئەمن دەزانم چۆتە کوێ » •**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲۲۳ )

ئەوان ـ کەسی سێیەمی کـۆ •

**... وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتیی ناردیە کن ئەوان •**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲۲۳ )

نموونە بۆ ئەو جێناوانەی بە بێ ( ئە ) دەستپێدەکەن :

من ـ کەسی یەکەمی تاك •

**مامۆستا گوتی : « ڕۆلە ، میرمەم ، سـەبرێکیبگرە ، زەحمەتی من بە خۆڕایی مەدە » •**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲۲۳ )

تۆ / توو ـ کەسی دووەمی تاك •

**ئەو میرمەمی لە یەمەنێ دەبەر تۆی ناوە سی جزووی قورعـانێ**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲٤۸ )

**... ئەمشۆ بە بەختی توو پێنج گەوم گرتوە**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۸۰ )

وی ـ کەسی سێیەمی تاك •

**... تفەنگی خۆی پڕکرد ، ڕووی لە سینگی وی کرد لێی ئاوردا**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۸۳ )

مە ـ کەسی یەکەمی کـۆ •

**دەیگوت : « بەنگینە ، ئەو لەشـــــــکرەی بابی مـە بۆ مـەی دروستکردووە داخولا ! چلۆنە ، تەواوە ؟ »**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲۵۰ )

نگۆ ـ کەسی دووەمی کـۆ •

**کوتی : « لەنگۆم دموێ قەلاّ و باڵەخانێك خشتێکی لە زێـڕی ، خشتێکی لە زێوی بێ » •**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۹٦ )

وان ـ کەسی سێیەمی کـۆ •

**ئەحمەد پادشـــــا بـە دووی واندا ، هاتە سەر بەحرەکەی ، چاوەنۆڕی وان بوو •**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۹۸ )

**تێبینی :**

۱ ـ تێکڕای جێناوەکانی دەســـــتەی دووەم ( جگە لە « وی » ) ، هەر ئەوانەی دەستەی یەکەمن و ( ئە )یان پێوە نییە ••• هەرچی (وی)یشە دیسان هەر ( ئە )ی لێقرتاوە ، بەلاّم (ی)یەکی خراوەتە سەر •

۲ ـ جێناوەکانی دەســــتەی یەکەم چۆن بەکاردەهێنرێن ، ئەوانی دەستەی دووەمیش ( جگە لە « نگۆ » ) بەهەمان چەشـــن کاردەکەن ••• بەلاّم ( نگۆ ) ئەگەر پریپۆزیشـــنێکی لەپێشـــەوە نەیەت ـ واتـە بێتوو پریپۆزیشنی لەپێشەوە نەبێ ـ ئەوە فۆرمی ( ئەنگو ) بەکاردێ • بەوێنە :

**••• سێ شـــــــێری وەك ئەنگۆ ڕاوەستێ لێرە ، ئەمن چلۆن پشتم دە نگۆ دەکەم •••**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲٥۹ )

**دەڵێ : « براله ، هیچ لە نگۆم نیە گلەیی‌یە » •**

( تحفەء مظفریە ، ب ۲ ، ل ۸۷ )

جگە لەو دوو دەستە سەرەکییەی دەســتنیشانمانکردن ، هەروەهـا هەندێ حاڵەتی‌تر بەرچاو دەکەوێ :

١ ـ بۆ کەسی یەکەمی تاك ، جگە لە ( ئەمن ، من ) جارجارە ( ئەز )یش دەبینرێ ، وەك :

**خوشکێ ، ئەزت ببم بە قوربانە !**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٢٦ )

**ئەزو (٧) ببم بە قوربانی هەردووك چاوانە !**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٥٦ )

هەندێ جار لە جیاتی ئەم ( ئەز )ەی کە سەرەتای ( ئە )یە ، وشەی ( وەز ) بەکاردێنرێ ، وەك :

**خوشکێ ، وەزو ببم بە قوربانە !**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٥٦ )

٢ ـ بۆ کەسی دووەمی کـۆ وێڕای ( ئەنگۆ ، نگۆ ) ، هەروەهـا فۆرمی ( ئینگۆ )ش هەیە ، وەك :

**... کوتی : « هەتتا ئەمن زیندووم یایەزین ئینگۆ هەسێکانە ؛ ئینجا هەرچی خولا داینێ ئی وی بێ » .**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٩٤ )

**... ئاغایەتیی من لە ئینگۆ کەمتر نییە ...**

( تحفەء مظفریە ، ب ٢ ، ل ٨٩ )(٨)

جێناوی کەسیی جودا لە ئاخاوتن‌و فۆلکلۆری ناوچەی موکریاندا بەو چەشنەیە کە باسمانکرد . بەڵام هەرچی زمانی ئەدەبە ، زۆر لـە شـێوەی سلێمانی ـ زمانی ئەدەبی ـ نێزیك‌کەوتووەتەوە • بەوێنە :

---

(٧) د. قەناتی کوردۆ ، کە دەڵێ فۆرمی ( ئەزو ) لە بەشـــــە دیالێکتی موکریدا دەبینرێ ( بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ، ل ١٠١ ) ، هەستی بەوە نەکردووە کە ئەو ( و )ەی کۆتایی جێناوی لـکاوەو لـە ئەسڵدا ( ت )ی کۆتایی ( ئەزت )ەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە .

(٨) د. کەریمی ئەیووبی‌و د. ئی. ئا. سـمیرنۆڤا ناوی ئـەم جێناوانـە ( ئەتوو / توو ، ئەز / وەز ، ئینگۆ )یان نەبردووە ( بڕوانە : « کتێبی دیالێکتی موکری » ، ل ٤٤ ) .

١ ـ لە ئاخاوتن و فۆلکلۆردا بۆ کەسی یەکەمی کۆ ( ئەمە ، مە ) بەکاردێ ، بەڵام لە زمانی ئەدەبدا ( ئێمە ) ـ واتە وەك لە سلێمانی .

بەنموونە :

بەنیرو ڕۆنەکەی ئێمە بە زاری
ئەوان دەخورا ، دەما بۆ ئێمە هەر دۆ

( هێمن ، ل ٦٦ )

٢ ـ لە زمانی ئەدەبدا بۆ کەسی دووەمی کۆ وەك سلێمانی ( ئێوە ) بەکاردێنرێ ، بەڵام لە ئاخاوتن و فۆلکلۆردا ( ئەنگۆ / نگۆ / ئینگۆ ) .

بەنموونە :

ئەوان وەك ئێوە ناژین تەمبەڵ و بێکار و ئاسوودە
ئەوان وەك ئێوە ناخۆن شەربەت و شەکراو و پالوودە

( هێمن ، ل ٦٠ )

٣ ـ لە ئاخاوتن و فۆلکلۆردا بۆ کەسی سێیەمی تاك ( ئەو ) و (وی) بەرچاودەکەون ، کەچی لە زمانی ئەدەبدا ( وی ) بەدەگمەن دەبینرێ و پتر ( ئەو ) بەکاردێنرێ ، کە لە شێوەی سلێمانیدا تاکە جێناوی کەسی سێیەمی تاکە .

دبێتە مەیدان و دەڵێ : من دەمەوێ مافی ژیان
تازە هەڵناخەڵەتێ ئەو ، بەقسەی نەرمونیان

( هێمن ، ل ٨٣ )

٤ ـ هەرچی کەسی یەکەم و دووەمی تاك و کەسی سێیەمی کۆیە ، جیاوازییان لەنێوان زمانی ئەدەب و ئاخاوتن و فۆلکلۆردا تێدا ناکرێ ـ واتە هەردوو فۆرمی بە ( ئە ) دەستپێکراوو بە بێ ( ئە )یان هەیە .

جێناوی کەسیی جودا لە بەشە دیالێکتی سۆراندا زۆر لە بەشە دیالێکتی موکری نزیکە . لە ئاخاوتن و فۆلکلۆری ئەم بەشە دیالێکتەشدا

بە شێوەیەکی سەرەکی دوو فۆرم ـ بە (ئە) دەستپێکردوو و بێ (ئە) ـ بەرچاودەکەوێ • واتـە :

١ ـ ئەمن ، ئەتۆ / ئەتوو ، ئەو ، ئەمە ، ئەنگۆ ، ئەوان •

٢ ـ من ، تۆ / توو ، وی ، مە ، نگۆ ، وان •

نموونە بۆ ئەو جێناوانەی بە ( ئە ) دەستپێدەکەن :

ئەمن ـ کەسی یەکەمی تاك •

**ئەمن خولامەکی حیزو دز نیمە عەیشـــانم بـە دزی لە فەرخۆی نەستاندیە ئەمن فەرحۆم لەسەرێ مەیدانێ کوشتیە •**

( لاوك ، ل ١٨ )

ئەتۆ / ئەتوو ـ کەسی دووەمی تاك •

**ئەتۆی چـاوم ، ئەتۆی بـاڵی فرینم**
**ئەتۆی ڕووحم ، ئەتۆی ڕەمزی نەجاتم**

( میهری ، ل ٢٦ )

**کچ : ئەتوو شیشی من کەبـابم**
**ئەمـن لـــە تـوو چێتـر نـابـم**

( فۆلکلۆر ، ل ١١٥ )

ئەو ـ کەسی سێیەمی تاك •

**ئەو گۆتی ئەمن ئەوهـام کرد •••**

( لاوك ، ل ١٠٠ )

ئەمە ـ کەسی یەکەمی کۆ •

**ئەمە دەگەر بابت حەفت ڕۆژان پێکدیمان هێناو بردیە •••**

( لاوك ، ل ٢١ )

ئەنگۆ ـ کەسی دووەمی کۆ •

**ئەنگـۆ وەرن زەینێ خـۆ بـدەنێ**
**گەوارەکی دەهینا چەند ڕەشی تاری**

( فۆلکلۆر ، ل ٢٢٠ )

ئەوان ـ کەسی سێیەمی کۆ •

**... کە ئیسلامەك بەوێندەرێکەدا بچی ئەوان بەرایی لێبگرن بیکوژن ...**

**( لاوك ، ل ٢١ )**

نموونە بۆ ئەو جێناوانەی بە بێ ( ئە ) دەستپێدەکەن :

من ـ کەسی یەکەمی تاك •

**سەرێ بەندانم عەیشێ**

**. . . . . . . . . . . . .**

**غرمەی دێ لەبن کەوشێ**

**مندالە و بە من ناشێ**

**( فولکلۆر ، ل ٧٧ )**

تۆ / توو ـ کەسی دووەمی تاك •

**لەگەر تۆمە و بە تۆ دەرێم**

**ئاشقی شەمامەی ( باغەر )ێم**

**سوندم خواردیە بەکەس نەرێم**

**( فولکلۆر ، ل ٧٧ )**

**ئەمان تەعبیرێ خەونێ توو لەکن فەرحۆیێ پیرەبابێ توو نەبێ لەکن چ کەسینکە نیە •**

**( لاوك ، ل ١٢ )**

وی ـ کەسی سێیەمی تاك •

**. . . . . . . . . . . .**

**سەبارەت بە چاوی وی**

**کەتمەی زاری گولانێ**

**( فۆلکلۆر ، ل ٨٥ )**

مه ــ كەسی یەكەمی كۆ .

**سوارەك دێ لۆ مالێ مــە ئەگەر سەلامی كرد .**

( لاوك ، ل ١٨ )

نگۆ ــ كەسی دووەمی كۆ .

**ئەوجه چەتۆ دگۆ منێ نەهاتیمە ئەلعانەكــه ئەنگــۆ چلن یێبــكەكی لەنگۆ(٩) بەراستیە .**

( لاوك ، ل ٢٥ )

وان ــ كەسی سێیەمی كۆ .

**ئەو میرۆیه چبوو لــه مارێ وان بوو ...**

( لاوك ، ل ٤٥ )

جگە لەو دوو دەستە سەرەكییەی باسمانكرد ، هەروەهــا هــەنــدێ حالەتی‌تر دەبینرێ :

١ ــ بۆ كەسی یەكەمی تاك ، جگە لــــه ( ئەمن ، من ) جــارجــاره ( ئەز )یش بەرچاو دەكەوێ ، وەك :

**ئــەز چوومــه ملكێ بەنــدێ**
**گەیشـــــتمه كیــژێ رەنــدێ**
**كــورێ پێدەكـــەن گەوەنــدێ**

( فۆلكلۆر ، ل ١٥٠ )

واش رێ‌دەكەوێ لەبریتی ( ئــەز ) ، وشەی ( هــەز ) بەكاردێنرێ ، وەك :

**هــەز هاتمه ســـەری گری**
**دێــدەمــه بدرتــــه تــری**

( فۆلكلۆر ، ل ١١٢ )

---

(٩) لەم بەشە دیالێكتەشدا ، فۆرمی ( نگۆ ) كاتێ دەتوانرێ بەكاربهێنرێ ، كە پریپۆزیشنێكی لەپێشەوە بێت .

٢ ـ بۆ کەسی دووەمی کۆ وێڕای ( ئەنگۆ ، نگۆ ) ، هەروەها فۆرمی ( ئێنگۆ )ش بەرچاودەکەوێ ، وەك :

**گوتی : بەخوای دەزانم بە مەملەکەتێ تەیاندا هاتم وە مەملەکەتەکە ئێنگۆ بوو ...**

**( لاوك ، ل ٩٧ )**

بەو نموونانەدا دەرکەوت ، کە جێناوی کەسیی جودا لە ئاخاوتن‌و فۆلکلۆری ناوچەی سۆران‌و موکریاندا ئێجگار لەیەك نێزیکن ... سەرەڕای ئەوە ، چۆن ئەو جێناوانە لە زمانی ئەدەبی خەڵکی موکریاندا قاڵبی شێوەی سلێمانی وەرگرتووە ، هەر بەو چەشنە هی ناوچەی سۆرانیش وەك هی سلێمانی لێهاتووە . بە نموونە :

١ ـ لە ئاخاوتن‌و فۆلکلۆردا ( ئەمە ، مە ) ـ جێناوی کەسیی جودای کەسی یەکەمی کۆیە ، بەڵام لە زمانی ئەدەبدا بە زۆری ( ئێمە ) بەرچاودەکەوێ ، بە وێنە :

. . . . . . . . . . . . . . . .

**تەماشاکەن لە مەبعووسانی ئێمە وەکو حەیوان لغاوی لێ درایە**

**( میهری ، ل ٤٥ )**

٢ ـ لە زمانی ئەدەبدا بۆ کەسی دووەمی کۆ وەك سلێمانی ( ئێوە ) بەکاردێنرێ . بەڵام لە ئاخاوتن‌و فۆلکلۆردا ( ئەنگۆ / نگۆ / ئێنگۆ ) . بە وێنە :

**ئەم سەگانەی کە لە لای ئێوە وەکیل‌و وکەلان**
**بێنە لای تۆ بەخوا نایکەیە گاوان‌و شوان**

**( کۆیی ، ل ٢٣ )**

٣ ـ لە ئاخاوتن‌و فۆلکلۆردا بۆ کەسی سێیەمی تاك ( ئەو )و ( وی ) بەرچاودەکەون ، کەچی لە زمانی ئەدەبدا ( وی ) بەدەگمەن دەبینرێ‌و پتر

( ئەو ) بەکاردێنرێ ، کە لە شێوەی سلێمانیدا تاکە جێناوی کەسی سێیەمی تـاکـە .

**میهری بۆیـە وا نەخۆشــە ، وا پەشـــێوە دایما**
**هەر لەبەر ئەم وەزعە ئـەو جەرگی براوە لەتلەتە**

**( میهری ، ل ٤١ )**

**چەند سەرنجێك :**

* ئەمڕۆ کە دەوترێ ( لەو ، لەوان ... ) ئەوە ئەســـــلەکەیان ( لە ئەو ، لە ئەوان ... ) بوودو ( ئە/ە )کەی ســـــەرەتایان تێچووە . لە ئاخاوتن‌و نووسینی ئەمڕۆی بەشە دیالێکتەکانی خوارووا لـەوانـەیـە بڵێین خەڵك هەموو ، وشەکان بەبەکەوە دەڵێن‌و بە یەکەوە دەیان‌نووسن ـ واتە مەودا ناخەنە نێوان پرپێۆزیشنەکەو وشەی دوایەوە .

* تێکرای جێنـاوەکان دەتوانن نیشـــانەی ( ێك ، ێ ... )ی نەناسیاوی وەربگرن[١٠] ، بەڵام هیچیان نیشــــانەی ( ەکە ، ە ... )ی ناسیاوی قبوول‌ناکەن .

* نیشانەی ( ی ... )ی ئیزافە دەچێتە سەر هەموو جێناوەکان ، کەچی ( ە ... )ی ئیزافە بەهیچ کامێکیانەوە نالکێ .

**کورتە بەراوردێك :**

فۆرمی ئەمڕۆی جێناوی کەسیی جودای زمـــانی ئەدەبی دیالێــکتی خواروو بە ڕەچەڵەك پێوەندی تەواوی بە فۆرمی جێناوی کەسیی جودای زمانی ئەدەبی دیالێکتی ژووروووەوە هەیە :

* لـــە هــەردوو دیالێکتدا ، چ لـــە زووداو چ ئەمڕۆ بۆ کەسی یەکەمی تاك جێناوی ( من ) بەکارهێنراوەو بەکاردەهێنرێ ... لە دیالێکتی

---

(١٠) لێرەدا ئەو واتایە ناگەیەنێ کە لە باری ئاسایدا دەیگەیەنێ .

ژووروودا تـا ئەمڕۆش بۆ دۆخی ڕاســـتەوخۆی کەسی یـەکـەمی تـاك جێناوی ( ئەز ) دەورێکی چالاك دەبینێ • ئەم جێنـــاوە لـــە دیالێـــکتی خوارووودا زوو لە کاردا بوو ، بەڵام ئێستا تێداچووە •

* بـۆ کـەسی دووەمی تـاك لـە دیـالێـکتی خوارووودا ( تـۆ ) بەکاردێنرێ‌و لە دیالێکتی ژووروودا ( تـو ، تـە ) • ئاشـکرا دیارە کـە ( تۆ/تو ، تە ) شێوەی فۆنەتیکی یەکترن •

* ( ئەو )ی کەسی سێیەمی تاکی دیالێکتی خواروو وەك (ئەو)ی کەسی سێیەمی دۆخی ڕاستەوخۆی دیالێکتی ژووروووە • هەرچی ئە (وێ) ، ئە ( وی )یشە کە لە دیالێکتی ژووروودا لـە دۆخی‌تیـانـدا بەکاردێ لـە بناغەی ( ئەو )و ( ێ )ی نیشانەی جنسی مێ‌و ( ی )ی نیشـــانەی جنسی نێر سازبووە •

* جێناوی ( ئێمە )ی کـەسی یـەکـەمی کـۆ و ( ئێوە )ی کەسی دووەمی کۆ بە ڕەچەڵەك لە ( مە )و ( وە )وە نێزیکەو بە ڕوخســـــار وا پێ‌دەچێ ئەوانی کرمانجیی خواروو ( ئێ )یان پێوەبێ‌و ئەوانی کرمانجیی ژووروو پێوەیان نەبێ •

* سەرنج ڕاکێش فۆرمی ( ئەوان )ی کەسی سێیەمی کۆیە ، کە لە دیالێکتی خواروو و ژووروودا وەك یەکە • ئەم جێنـاوە نـەك هـەر لـە دیالێکتی خوارووودا بـــە دۆخەوە بـەنـد نیيە ، بەڵـکو لـــە کرمانجیی ژوورووشدا هەر بەو چەشنەیە •

**کێشەی دۆخ :**

* دیارە لە کرمانجیی ژووروودا بەپێی ئەرك سنووردانان لەنێوان دۆخی ڕاستەوخۆو تیانـداو لە دیالێکتی خوارووودا نەمانی دۆخ بووەتـە هۆی پەیدابوونی جیاوازی •

* تێکەڵاوکردنی فۆرمی دۆخی ڕاستەوخۆو فۆرمی دۆخی تیان لە شێوەی ئەمڕۆی دیالێکتی ژووروووش و خوارووشدا بەرچاو دەکەوێ •

* لە بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی خوارووودا ، هەرچەندە جێناوی کەسیی جودا دۆخی نییە . بەڵام حاڵەتی وا بەرچاودەکەوێ ، کە فۆرمی بەکارهێنراو لە ڕووی فۆنەیک لە بەجێهێنانی ئەرکەوە لەگەڵ دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا یەکبگرنەوە •

* لە بەشە دیالێکتەکانی دیالێکتی خوارووودا بەکارهێنانی فۆرمی جیاواز بۆ دۆخی ڕاستەوخۆو دۆخی تیان وەنەبێ بە ڕێکەوت بێ • بوونی ئەو جیاوازییە ئەوە نیشاندەدات ، کە لە زوودا دوو فۆرمی بە فۆنەتیك لەیەکتر نێزیك بۆ دۆخی ڕاستەوخۆو دۆخی تیان هەبووبێ •

* لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا کەسی یەکەمی تاك دوو فۆرمی هەبوو :

یەك ـ « ئەز » کە لە دۆخی ڕاستەوخۆدا بەکاردەهێنراو لە « ئەدەم »ی فارسیی کۆن و « ئەزەم »ی ئاویستای دۆخی ڕاستەوخۆوە کەوتووەتەوە •

دوو ـ « من » کە لە دۆخی تیاندا بەکاردەهێنراو لە « مەنا »ی حاڵەتی جەڕی فارسیی کۆنەوە کەوتبووەوە •

دۆخی ڕاستەوخۆی کەسی یەکەمی تاکی جێناوی کەسیی جودای « ئەز » لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە واقیعدا بووبووە فۆرمێکی نیمچەمردوو • لە تێکستدا کەم بەرچاودەکەوێ • ئەرکی هەرە دیاری بینینی دەوری کارا بوو لەگەڵ کرداری تێنەپەڕ لە هەموو کاتەکانداو لەگەڵ کرداری تێپەڕ لە کاتی ڕابوردوودا •

دۆخی تیانی کەسی یەکەمی تاکی جێناوی کەسیی جودای « مەن » ، لە ڕستەدا دەیتوانی هەموو ئەرکێك ببینێ •

بەم شێوەیە جێناوی « مەن »ی کەسی یەکەمی تاکی دۆخی تیانی کۆن ، لە فارسیی ناوەڕاستدا لە واقیعدا دەبێتە فۆرمێکی گشتی بە کەسی یەکەمی تاكو لەسەرخۆ تەنگ بە « ئەز »ی فۆرمی دۆخی ڕاستەوخۆ هەڵدەچنێ •

« توو »ی جێناوی کەسی دووەمی تاكو « ئەماه »ی جێناوی کەسی یەکەمی کۆو « شماه »ی جێناوی کەسی دووەمی کۆ دۆخیان نەبوو •

بۆ کەسی سێیەمی تاك ، جێناوی نیشاندانی ئـ ( و ) بەکاردەهێنراو بۆ کەسی سێیەمی کۆش ( ئشان ) • کەسی سێیەمی تاكو کۆش هەروەها دۆخیان نەبوو[11] •

## جێناوی کەسیی لکاو

زوربەی ئەو نووسەرانەی دەربارەی جێناوی کەسیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجی خوارووا دواون ، ئەگەرچی تا ڕادەیەك لەسەر ئەوە هاودەنگن کە دوو دەستە جێناوی لکاو لەو دیالێکتەدا هەیە ••••• بەڵام لە دیاریکردنی هەندێ جێناودا جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە •

جێناوی لکاو لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :

**١ ـ جۆری بەهێز :**

ئەم جۆرە ئەو جێناوانەن کە لە ڕابووردووی تێپەڕدا بەکاردێن ، وەك :

---

(١١) ف• س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٥٤ ـ ٦٢ •

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونـــە |
|---|---|---|---|
| تـاك | یەکەم | م | ناردم ، فرۆشتم ، خواردم ، نووسیم .... |
| | دووەم | ت | ناردت ، فرۆشتت ، خواردت ، نووسیت .... |
| | سێیەم | ی | ناردی ، فرۆشتی ، خواردی ، نووسی .... |
| کـۆ | یەکەم | مان | ناردمان ، فرۆشتمان ، خواردمان ، نووسیمان .... |
| | دووەم | تان | ناردتان ، فرۆشتتان ، خواردتان ، نووسیتان .... |
| | سێیەم | یان | ناردیان ، فرۆشتیان ، خواردیان ، نووسییان .... |

## ٢ ـ جۆری بێهێز :

ئەوانەن کە لە ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەردەکەونو بەدوا ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕدا دێن ، وەك :

### ا ـ ڕابووردووی تێنەپەڕ :

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونـــە |
|---|---|---|---|
| تـاك | یەکەم | م | نووستم ، چووم ، مردم ، گەڕام .... |
| | دووەم | ی | نووستی (یت) ، چووی(یت) ، مردی(یت) ، گەڕای(یت) . |
| | سێیەم | . | نووست ، چوو ، مرد ، گەڕا .... |
| کـۆ | یەکەم | ین | نووستین ، چووین ، مردین ، گەڕاین .... |
| | دووەم | ن | نووستن ، چوون ، مردن ، گەڕان .... |
| | سێیەم | ن | نووستن ، چوون ، مردن ، گەڕان .... |

ب – ڕانەبووردووی تێپەڕ :

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونــــە |
|---|---|---|---|
| تــاك | یەکەم | م | دەنێرم ، دەفرۆشم ، دەخۆم ، دەنووسم .... |
| | دووەم | ی | دەنێری(یت) ، دەفرۆشی(یت) ، دەخۆی(یت) ، دەنووسی(یت) ... |
| | سێیەم | ٠ | دەنێرێ(ێت) ، دەفرۆشێ(ێت) ، دەخوا(ات) ، دەنووسێ(ێت) .. |
| کــۆ | یەکەم | ین | دەنێرین ، دەفرۆشین ، دەخۆین ، دەنووسین ... |
| | دووەم | ن | دەنێرن ، دەفرۆشن ، دەخۆن ، دەنووسن .... |
| | سێیەم | ن | دەنێرن ، دەفرۆشن ، دەخۆن ، دەنووسن .... |

ج ـ ڕانەبوردووی تێنەپەڕ :

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونـــە |
|---|---|---|---|
| تـــاك | یەکەم | م | دەنووم ، دەچم ، دەمرم ، دەگەڕێم .... |
| | دووەم | ی | دەنووی(یت) ، دەچی(یت) ، دەمری(یت) ، دەگەڕێی(یت) .. |
| | سێیەم | . | دەنوێ(ێت) ، دەچێ(ێت) ، دەمرێ(ێت) ، دەگەڕێ(ێت) .. |
| کـــۆ | یەکەم | ین | دەنووین ، دەچین ، دەمرین ، دەگەڕێین .... |
| | دووەم | ن | دەنوون ، دەچن ، دەمرن ، دەگەڕێن .... |
| | سێیەم | ن | دەنوون ، دەچن ، دەمرن ، دەگەڕێن .... |

دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە دەمەتەقێیەکی ئەوتۆی لەسەر نییەو ئەمانەیە :

| ژمارە | کەس | جێناوی لکاو |
|---|---|---|
| تاك | یەکەم | م |
| | دووەم | ت |
| | سێیەم | ی |
| کۆ | یەکەم | مان |
| | دووەم | تان |
| | سێیەم | یان |

نموونە بۆ جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم

( م ) ـ کەسی یەکەمی تاك ـ « پێوام » :

**لەژێر ئاسمانی شینا ،**
**لەپاڵ لووتکەی بەفرینا ،**
**کوردستان گەڕام ،**
**دۆڵاو دۆڵ پێوام ؛**

( گۆران ، ل ٢٨ )

( ت ) ـ کەسی دووەمی تاك ـ « فەرمووت » :

**مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت**
**دەخیلت بم کە خانەی صەبرەکەم سووت**

( نالی ، ل ١٤٨ )

( ی ) ـ کەسی سێیەمی تاك ـ « دی ، وتی » :

**کـە خضر ئـەو خالەو خۆڵی بەردەرەی دی**
**وتی : تـۆ خاکی ، یـا ئـاوی حەیـاتی ؟!**

( مەحوی ، ل ٢٩٨ )

( مان ) ـ کەسی یەکەمی کۆ ـ « ڕوانیمان » :

**... وردە وردە هاتین ڕوانیمان لە دوورەوە تروسـکەی چـراو ئاگر دەرکەوت ...**

( لەخەوما ، ل ٣٢ )

( تان ) ـ کەسی دووەمی کۆ ـ « کردتان » :

**... ئێوە ئەم فەقیرەتان بردو کردتان بە کۆلکی موصیبەت ...**

( لەخەوما ، ل ٣٧ )

( یان ) ـ کەسی سێیەمی کۆ ـ « فرۆشتیان ، خنکاندیان » :

**هـەر بـە دوو سێ دەقیقـە خنکانیـان**
**زوو فرۆشـتیان بـە پـارە ئیمانیـان**

( زێوەر ، ل ٧٨ )

ئەم جێناوانە ئەگەرچی بە شێوەیەکی سەرەکی دەچنە سەر کرداری ڕابوردووی تێپەڕ ، بەڵام بە زۆر بەشە ئاخاوتنی تریشەوە دەلکێن ، وەك :

١ ـ دەچنە سەر ناو ، بەوێنە :

چاوم ، زوڵفت ، زستانمان ، میللەتتان .....

**لە چاوم خوێنی جاری کردو هەم ڕەنگی لە ڕوو بردم**
**ئەم ئاشـووبی دڵو دینە بـە لێوی ئاڵو چاوی کـاڵ**

( مەحوی ، ل ٢٠٢ )

**تـا سـونبولی زوڵفت لە نیهادی قەدت ئـاڵا**
**من دوودی هەناسـەم گەییـە عالـەمی باڵا**

( نالی ، ل ١١٥ )

**ناوقەدی جلەی زستانمان پچڕا**
**ئەمڕۆ پشکۆکەی هەوامان گرا**

( پیرەمێرد ، ل ١٣٧ )

**قەدری میللەتتان بە جاریّ شکان**
**نە حەیاتان ما نە ناوو نیشان**

( بێکەس ، ل ٥٧ )

٢ ـ بە ئاوەڵناوەوە دەلکێن . وەك :

تەڕم ، پاکمان ...

**ئەی ڕووناکی ڕێی باوەڕم**
**خوای بەهەشتی دڵی تەڕم**

( گۆران ، ل ٣٩ )

**ڕۆحمان بکەین بە پەرژین**   **بۆ خاکی پاکمان**
**لە دڵی میللەتدا بژین**   **بە ناوی چاکمان**

( پیرەمێرد ، ل ٣٥٣ )

٣ ـ لەگەڵ زوربەی جێناوەکاندا دێن :

أ ـ لەگەڵ جێناوی کەسیی جودا . وەك :

منیان ، تۆم ، ئێمەت ...

**.... لە پاشان دوان لەو باجگرانە هاتن بە لای منەوە ، لەو تاریکاییەدا ، سەیرێکی سەرو سەکوت و قەدو قیافەتی منیان کرد ...**

( لەخەوما ، ل ٣٣ )

**بیستو حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم**
**بە نانو ئاوو جلو بەرگی خۆم**

( بێکەس ، ل ٧٥ )

**گەر بتی ئێمەت نەدیوە ، بۆچی دوێنێ دەتپەرست ؟**
**ئەی بورەهمەن ، تۆ لە لات ئەمڕۆ کەچی وەك لاکە ( لات )**

( مەحوی ، ل ٦٠ )

ب ـ لەگەڵ جێناوی خۆیی • وەك :

خۆم ، خۆت ، خۆمان ، خۆتان •••

**کەڕووی لێ‌نیشـــت گەردی شیعرم ،**
**هەی جوانەمەرگ خـۆم ! هەی بمرم ! •••**

( گۆران ، ل ٣٩ )

**لەومەی زەمان دەکەی کـە بۆچ خواریی ڕاسـتیی دەوێ**
**غافڵی دەستی ڕاستی خۆت خزمەتی دەستی چەپ دەکا**

( نالی ، ل ٩٩ )

**••• کاروانچیەکان وتیـــان ، ئێمە هەرچیەکمان کردووە ئـەبێ ئەمشەو خۆمان بگەیەنینە ناوشار •**

( لەخەوما ، ل ٣١ )

**سا توخوا کوڕگەل ئێوەو خوای خۆتان**
**سـەیرکەن لـە باتیم تا دەلوێ بۆتـان**

( پیرەمێرد ، ل ١٨٠ )

ج ـ لەگەڵ جێناوی نیشانە ، وەك :

ئەمەمان ، ئەوەتان ، ئەوەم •••

**چنوور لـە کێوان ، وەنەوشـە لـە چەم**
**گوڵ لـە گوڵستان یەکیان‌گرت سـەرجەم**
**هاتنـە لام وتیان : تـۆ ڕابەرمـان بـە**
**ئەمەمـان بـۆ بکەو تاجی سـەرمان بە**

( پیرەمێرد ، ل ١٥٨ )

د ـ لەگەڵ جێناوی پرسیار ، وەك :

کامتان ، چیتان ••• کێتان ، چۆنیان •••

**وتی کامتـان ئەتوانێ**
**ئەم دارانـە بشکێنێ**

( بێکەس ، ل ١٩١ )

**... ئێوە کێنو لەکوێوە هاتوونو چیتان پێهەیە ...**

( لەخەوما ، ل ٣٢ )

هـ ـ لەگەڵ جێناوی نەفی ، وەك :

هیچم ، هیچت ، هیچی ، هیچمان ، هیچتان ، هیچیان

**وێڵو ســــەرگەردان بێتینو خەســـتەم**

**هیچم پێناکرێ ، دیلو دەس بەســـــتەم**

( بێکەس ، ل ٧٨ )

... و هەندێکی تر .

٤ ـ دەچنە سەر چەند جۆرێك لە ئاوەڵکردار :

أ ـ ئاوەڵکرداری شوێن ، وەك :

ئێرەم ، ئێرەمان ... ســەرەوەم ، سەرەوەمان ، ژوورەوەم ، ژوورەوەمان ...

ب ـ ئاوەڵکرداری کات ، وەك :

دوێنێمان ، سبەینێتان ...

جـ ـ ئاوەڵکرداری وەصفی ، وەك :

زۆرمان ماوە . خێرایان لێکردن ...

**هەر خێرا خێرا ئەمپرسی ، زۆرمان ماوە بگەینە شار یان نا ؟**

( لە خەوما ، ل ٣١ ـ ٣٢ )

**... هتد .**

٥ ـ بە ژمارەوە دەنووسێ ، وەك :

یەکێکیان ، سیانیان ، صەدمان ، هەزارتان ...

**ســـیانیان دەربارەی من لوتف کار بوو**

**بــەڵام یەکێکیان لــە پیــاو بێــزار بوو**

( پیرەمێرد ، ل ١٨٥ )

**هـاوار بـه مالـم چیمان پێ‌کرا**
**لـه چارەکێکا صـەدمان لێ‌خرا**

( بێکەس ، ل ٥٨ )

**نموەللا کەوابوو خوا هەڵناگرێ ، ڕەحمی پێ‌بکەن وازی لێ‌بێنن ،**
**هەزارتان بۆ دنیا کردووە ، ئەمەش بۆ خوا بکەن .**

( لە خەوما ، ل ٣٧ )

**... و گەلێ حاڵەتی تر[١٢] .**

جێناوەکانی کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆ ئاشکرا دیارن ، کە دووبارە بوونەوەی کەسی یەکەم و دووەم و سـێیەمی تـاکـن و ( ان )ی نیشانەی کۆیان خراوەتە سەر .

---

(١٢) هەندێ لە زمانەوانان وا ڕادەگەیەنن ، کە جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم بە پریپۆزیشنەوە دەلکێن :

د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم دەڵێ : « ڕاناوە لکاوەکان لەگەڵ ئـامـرازی ( بۆ ، پێ ، لێ ، لەگەڵ ) بـەکـاردەهێنرێن ... »و وشـــەکانی ( بۆم‌بێنێ ، بۆت‌دەکرم ... پێم‌دەڵێن ، پێمان‌وترا ... لێم‌گـەڕێن ، لێی‌مـەدەن ... لـەگـەڵت‌بێم ، لەگەڵی‌بڕۆن ... )ی بە نموونە هێناوەتەوە ( ل ٤٦٦ – ٤٦٧ ) .

لە سـەرەتادا ئەوە ڕووندەکەینەوە ، د. ئیبراهیم کـە دەڵێ ئامرازی ( بۆ ، بێ ، لێ ، لەگەڵ ) مەبەسـتی پریپۆزیشـنی ( بۆ ، بێ ، لێ ، لەگەڵ )ە .

بەڵێ ( بۆ )و ( لەگەڵ ) لە بنەڕەتدا پریپۆزیشنن ، بەڵام هەرچی ( پێ )و ( لێ )یە ئەگەرچی پێوەندییان بە پریپۆزیشنەوە هەیـە ، بەڵام بەر لە هەرشت پێشگرن ...

پێشگری ( پێ )و ( لێ ) ئاوەڵی تری سادەی ( تێ ، وێ ... )و ناسادە ( پێدا ، تێدا ، پێوە ، تێوە ... پێك ، تێك ، لێك ... )یـان هەیەو جێناوەکان لەگەڵ ئەمانیشـــدا بەکاردێن و د. ئیبراهیم ناوی نەبردوون .

| | تـاك | كـۆ |
|---|---|---|
| کەسی یەکەم | م | م + ان ← مان |
| کەسی دووەم | ت | ت + ان ← تان |
| کەسی سێیەم | ی | ی + ان ← یان |

ئەو جێناوە لکاوانەی ئەمڕۆ لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا بەکاردێن جیاوازییان لەگەڵ زمانی فارسیی ئەمڕۆو فارسیی ناوەڕاستدا تەنیا لە فۆرمی کەسی سێیەمی تاکو کۆدایە .

لە زمانی فارسیی ئەمڕۆدا :

| | |
|---|---|
| م | مان |
| ت | تان |
| ش | شان(١٣) |

---

وێڕای نادروستی دانانی ( پێ ، لێ ) بە پرێپۆزیشن ، ئەوەش دەخەینە پێش‌چاو کە هۆی هاتنی جێناوەکان لەگەڵ ئەم پێشگرانەدا ، ئەو دەستوورە ئاشکرایەی زمانی کوردییە :

جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم کە لەگەڵ کرداری سادەدا دێن ، دەکەونە کۆتاییەوە ، بەڵام ئەگەر کردارەکە داڕێژراو بێ ، دێتە پێشەوەو بە پێشگرەکەوە دەلکێن ، وەك :

گرتم ــ تێم‌گرت . لێم‌گرت ، دام‌گرت ، هەڵم‌گرت ، ڕام‌گرت ...
گرتمان ــ دامان‌گرت ، هەڵمان‌گرت ، ڕامان‌گرت ...
کردم ــ تێم‌کرد . لێم‌کرد ، ڕۆم‌کرد ...
کردمان ــ تێمان‌کرد ، لێمان‌کرد ، ڕۆمان‌کرد ...

هەرچی ( بۆ )و ( لەگەڵ )یشە ، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا پرێپۆزیشتن ، بەڵام لەو نموونانەدا کە د. ئیبراهیم هێناونی‌یەوە لە هەر حاڵەتێکی دیدا کە جێناو وەردەگرن گەلێ پرسیاریان لەسەر هەڵدەستێ .

(١٣) بڕوانە :

أ ــ ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٢٦ .

ب ــ علی برناك ، دستور زبان فارسی ، ١٣٤٧ ، ل ٢٦ .

له زمانی فارسیی ناوەڕاستدا :

| | |
|---|---|
| م | **مان** |
| ت | **تان** |
| ش | **شان**(١٤) |

ڕ. ل. تسابۆلۆڤ وا ڕادەگەیەنێ ، کە بەرانبەر **فۆرمی** ( شم ، شایی )ی کەسی سێیەمی فارسیی کۆن لە ئاوێستادا **فۆرمی** ( هیم ، هی هەیە . بۆیە دەتوانرێ بووترێ کە لە زمانە ئێرانییەکانی ئەمڕۆدا دوو سیستەمی جیاوازی جێناوی لکاو بەدی دەکرێ ، **یەکێکیان** لە فارسیی کۆنەوە کەوتۆتەوەو ئەوەیە کە **فۆرمی کەسی سێیەمی تاك** ( ش )ەو لە ( شم ، شایی )یەوە وەرگیراوە . دووەم ئەوەیە ، کە لە ئاوێستاوە هاتووەو **فۆرمی** کەسی سێیەمی تاکی (ی)یە (**وەك له کوردیدا**)و بەچەی ( هیم ، هی )یە(١٥) .

تێکستی کوردی چۆن ئەوە دەردەخات **فۆرمی** ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) چ لە زوووداو چ ئەمڕۆ لە بەشە دیالێکتە سەرەکییەکانی دیالێکتی خوارووی کوردیدا **فۆرمی** ستانداردو سەرەکیی بێ گومان جێناوی کەسیی لکاوی دەستەی یەکەمن ، ئەوەش ڕادەگەیەنێ ، کە لە هەندێ ناوچە لە زوودا یان ئێستاکە چەند **فۆرمی** دیش هەبوون یان هەن .

بە وێنە لە بەشە دیالێکتی موکریدا بۆ کەسی یەکەمی کۆ جگە لە ( مان ) **فۆرمی** ( ن )ش بەرچاو دەکەوێ .

---

(١٤) ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ . ل ٥٧ .

(١٥) ڕ. ل. تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢٦ .

وەك :

کێمان // کێن

**« خولایە لــە دووی مەخســـــودو مرادان دەچین کێن دێ دەهانایە » .**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٦٩ )

هەر لەم بەشە دیالێکتەدا بۆ کەسی دووەمی کۆ ناوە ناوە (و) لە جێی ( تان ) دەبینرێ . وەك :

**ماڵتان // ماڵو**

**« کوتی : ماڵو شێوی ، ئەنگۆ شێت بوون ..... »**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ل ١٩٣ )

**چلۆنتان // چلۆنو**

**« وتیان چلۆنو خۆ دەگیر خست .... »**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ١٩٣ )

پێویستە سەرنج بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، کە هەندێ جار ئەو ( و )ە بۆ کەسی دووەمی تاکیش بەکاردێ . وەك :

**ئەمزو // ئـەمز**

**« خوشکێ ، ئەمزت ببم بەقوربانــە !**

**. . . . . . . . . . .**

**. . . . . . . . . . .**

**خوشـــکێ ، ئـەمزو ببم بەقوربانە ! »**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٦٩ )

**... هتد[١٦] .**

★ ★ ★ ★

---

(١٦) مەکەنزی و تسابۆلۆف وا ڕادەگەیەنن ( و ) بۆ تاکەو ( وو ) بۆ کۆیە ... ئەیووبی و سمیرنۆڤا تەنیا ( وو )یان دەستنیشانکردووە ، ئەویش بۆ کۆ ... مەکەنزی دەڵێ ، لە پشدەرو هەندێ ناوچەی دیش فۆرمی ( و ) و ( وو ) هەیە ... تسابۆلۆف ئەوەی دیاریکردووە ، کە لــە سنە بۆ کەسی یەکەمی تاك ( ۆ ) بەکاردێ ...

دەستەی دووەمی ئەو جێناوانە لە دوو ڕووەوە جێی دەمەتـەقێیە •
یەکەمیان ئەوەیە کەمێ لە زمانەوانان ئەم دەستەیە بـە جێناو دانانێن •••
ڕووی دووەم کە بناغەی مەسەلەکەیە ، ئەوەیە ، ئەوانەی بە جێناویان داناوە
یان شتێکی دی لە دیاریکردنی بەشێکیاندا جیاوازییەکی تەواویان لـە
نێواندا هەیە •

ئەگەرچی دەستەی دووەمی جێناوەکان وەك دەستەی یەکـەم چالاك
نین ، بەلام ئەمانیش هەروەك دەستەی یەکەم دەتوانن ببنە بەشـێك لـە
ڕستەو دەوری کارا یان بەرکار ببینن‌و جگە لەوەی بە کردارەوە دەلکێن ،
هەروەها دەچنە سەر گەلێ بەشە ئاخاوتنی تریش‌و ••• جا بۆیە ڕاسـت
نییە بە کۆتایی کردار لە قەلەم بدرێن •

ئەوەی پێوەندی بە کێشەی دیاریکردنی فۆرمیانەوە هەیە ، ئەوەیـە
گومان‌و دەمەتەقێ بە شێوەیەکی سـەرەکی لە فۆرمی کەسی دووەم‌و
سێیەمی تاکدایە •

**١ ـ کەسی دووەمی تاك :**

مامۆستا سەعید صدقی لە کتێبی « مختصر صرف‌و نحوی کوردی »دا
( ل ٢٩ ـ ٣٠ )و مامۆستایان جەمال جەلال عەبدوللاو ئەرنست مەکارۆس
لـە کتێـبی "Kurdish Basic Cours Dialect of Sulaimania"
( ل ١٥١ ـ ١٥٢ ) داو لە کتێبی « زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی
ناوەندی » ( ل ٥٦ )دا و مامۆستا ئەحمەد حەسـەن ئەحمەد لـە کتێبی
« ڕێزمانی کوردی » ( ل ١٥٩ ـ ١٦٧ )داو د• وریـا عومـەر ئەمین لـە
نەخشەی ژمـارە ( ٣ )ی وتاری « لایەنێکی جیـاوازی » ( ل ٢٦١ )داو
لیژنەی زمانی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەسـتەی کورد لـەو
بەرهەمەیدا کە بەناوی « بەراوردکاریی لە نێوان زارە کوردییەکانـدا »

بڵاوی کردوونەتەوە ( ل ٣٢٩ ) ... ( یت )یان بۆ کەسی دووەمی تاکی جێناوی لکاوی دەستەی دووەم دەستنیشان کردووە .

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە کتێبی « دەســــتووری زمانی کوردی » ( ل ٨٥ ــ ١٠٢ )دا ، ( ی ، یت )ی یادداشت کردووە .

د. ن. مەکەنزی لە کتێبی "Kurdish Dialect Studies" ( ل ١١٠ )دا وا ڕادەگەیەنێ کە لە سلێمانیو وارماوە : ( ی/یت ) باوەو لە بنگردو پژدەرو موکریانو هەولێرو ڕەواندزو خۆشناوەتی ( ی ) بەکاردێنن .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا ئەم فۆرمانەی « ی( یت ) ، ە ، . » بە وێنەی ئەو جێناوە داناوە ( ل ٩٢ ــ ٩٥ ) .

مامۆستا محەمەد مەعرووف فەتتاح لە وتاری « خۆیەتی لە زاری سلێمانیدا » ( ل ١٧٤ ) وای بۆ چووە ، کە جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی دووەم ( ت )ە .

مامۆستا مەسعوود محەمەد لە وتاری « سووڕێکی خامە بە دەوری ( ڕاناو )دا » ( ل ٩٠ ــ ٩٢ )و د. کەریمی ئەیووبی ، د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری » ( ل ٤٥ ــ ٤٧ )داو د. کوردستانی موکریانی لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین » ( ل ٦٨ )دا بۆ کەسی دووەمی تاکی دەســــتەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی دیالێکتی کرمانجی خواروو ( ی ) یان دیاری کردووە .

بە ڕای ئێمە ئەوانەی ( ت ) یان ( یت ) یان ( . ) یان ( ە ) ... یان بە جێناوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی دووەم داناوە بە هەڵەدا چوونو

تەنیا ئەو تاقمە ڕاست بۆ مەسەلەکە چوون کە ( ی )یان دەستنیشـــــان کردووە ... لەنێو ئەوانەشدا ، کە ( ی )یان دیاری کردووە ، مامۆســـتا مەســـــــعوود محەمەد نەبێ ، هەموو ئەوانی دی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ ئیسپاتکردنی ئەو کارەیان نەهێناوەتەوە ... شایانی باسە ، مامۆســـــتا مەســــــعوود چەنـد بەڵگەیەکی واقیعیو مێژوویی بۆ پتەوکردنی ئـەو بۆچوونەی هێناوەتەوە . ئێمەش لەسەر بنـاغـەی ئەو بەڵگانەو هەنـدێ بەڵگەیتر هەوڵ دەدەین ئەم تەمومژە ڕەوێنینەوە .

١ ـ ئەگەر بۆ دەستنیشانکردنو ڕوونکردنەوەی ئەو کێشــــەیە گەشتێك بە دیوانی شاعیرانی کۆنو نوێی ناوچەی ســـلێمانیدا بکەین ، ئەوە دەبینین لە زوودا فۆرمی ( ی ) بەکارهـاتووەو زۆر درەنگ فۆرمی ( یت ) پەیدابووە . بـە وێنـە لـە تێکڕای شیعرەکانی نالیو شاعیرانی دی سەردەمی ئەودا وێنەی ( یت ) نابینرێ :

**گاهێ دەبی بـــە ڕەوحو دەکـەی باوەشێنی دڵ**
**گاهێ دەبی بـــە دەم دەدەمێنی دەمی غـورروور**

( نالی ، ل ١٧٦ )

**داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی ( خالکو خۆڵ )**
**هەتا نەکەی بە خاکی ( سولەیمانی )یا عوبوور**

( نالی ، ل ١٨١ )

کاتێ بەرەو پێش بچینو بێینە سەردەمی مەحویو تەماشـای دیوانی مەحوی بکەین ، دەبینین دیسان هەر ( ی ) بەکارهێناوە :

**کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تـۆ ، دەکـەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا**
**کە خۆ دەرخەی وەکو خور دڵ وەکو شەونم لەخۆ بڕوا**

( مەحوی ، ل ٣٥ )

**شوکور تۆ لە فکرم ناچی ، ئەگەرچی من لە فکرت چووم**
**لـە من غایب نەبی تۆ ، بەسمە ، با من بم لـە تـۆ غایب**

( مەحوی ، ل ٥٢ )

زێوەر کە ماوەیەك بەدوا مەحوی‌دا هاتووە ٠ ئەمیش هەر لەســـەر ڕێڕەوی ڕاست ڕۆیشتووەو تێکڕا هەر ( ی )ی وتووە :

**تۆیش ئەگەر فرسەت لەدەست دەی ئەبیە مەملووکی کەسی**
**شــەو چرا هەڵــگر ئەبی ، ڕۆژیش ئەشۆی جامو لەگەن**

( زێوەر ، ل ١٣ )

**مەغریبی بــاری گەیــانــدە مەنزڵی ئەمنو ئـــەمـــان**
**تۆش لەناو قوڕدا چەقیوی ( عیش )و نۆشت زاری‌یە**

( زێوەر ، ل ١٢ )

هەندێ لە نووسەرانی سەردەمی زێوەر ناوە ناوە فۆرمی ( یت ) یان نووسیوە ••• هۆی پەیدابوونی ئەو ( ت )ە هەرشتێك بێ پەرەی سەندو سەری لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردیش شێواند ٠

٢ ـ تا ئەمڕۆش نەك هەر لە گەلێ شوێنی دەوروپشـــتی ناوچـەی سلێمانی[17] ، هەروەها لە دوو ناوچەی گرنگی سەر بە دیالێکتی کرمانجی خواروو ـ موکریانو ســـۆران ـ دا چ لـە زووداو چ ئەمڕۆ هەر ( ی ) دەبینرێ ٠ بە وێنە :

**••••• ئەتۆ زۆر بێ‌شەرمی لەپێش چاوی بەنی ئادەمی سواری مریشکی دەبی ، شەرمێ لە شای ناکەی •••**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ١٩٤ )

**ئەی ئــەو کەسەی دەتپەرستمو لێم ونی**
**تــۆ خودا نی ، تــۆ خۆشەویستی منی**

( تاریكو ڕوون ، ل ١٨٤ )

**لــەگــەر تــۆمــە ئــەی حەبیبم**
**مــن برینـــدارم تــۆی تــەبیبم**
**خــودا بتــکا بــە نســـــیبم**

( فۆلکلۆر ، ل ٥١ )

---

(17) D.N. Mac Kenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1957, P. 110.

**وەتـــەن مەفتـــوونتم ، مەحبووبمی تـــۆ**
**وە هیوامی ، ئەتـــۆی حـــافیـــزی دینم**

( میهری ، ل ٢٦ )

٣ ـ لە هەندێ بەشە دیالێکتی وەك هەورامی[١٨] ، لوڕی[١٩] ...دا ئەو جێناوە دیسان هەر ( ی )یە .

٤ ـ وەك مامۆســـــتایان : د. قەناتی کوردۆ[٢٠]و د. چەرکەزی بەکۆ[٢١] ... پەنجەیان بۆ ڕاکێشاوەو وەك بەرهەمی ئەدەبی نیشانیدەدا لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا تەنیا ( ی ) بۆ کەســـی دووەمی تاك لـــە کاردایـــە :

**شـــێخێم ! تـــو دزانی ئەڤ جزیرە**
**تێـــکدا کوبـــەراو کـــورد میـــرە**

( خانی ، ل ١٥٢ )

**گوتن : « ئەمان ، مەمۆ تۆ چ دکی ؟ ...**

( مەمێ ئالان ، ل ٥٨ )

**گـــەر لولوئی مەنثور ژ نەظمێ تـــۆ دخـــوازی**
**وەر شعرێ مەلێ بین تە ب شیرازێ چ حاجەت**

( جزیری ، ل ١٤٦ )

---

(١٨) بڕوانە :
أ ـ دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، تهران ، ؟ ، ل ١٢ .
ب ـ محەمەد ئەمین هەورامـــانی ، زاری زمـــانی کـــوردی لە ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٢ .
(١٩) حەمیدی ئێزەد پەناھ ، فەرهەنگی لەکو لوڕ ( لێدوانو بەراوردکردنی: مەحموود زامدار ) ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٢٢٤ .
(٢٠) د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، دەســـــــــتووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٩٥ .
(٢١) د. چەرکەزی بەکۆ ( باکایێف ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٧٣ ، ل ١٧٠ .

٥ ـ ئەگەر تەماشای هەندێ لەو زمانانە بکەین ، کـــە خزمایەتیان لەگەڵ زمان کوردیدا هەیە ، دیسان دەبینین ، ئەو جێناوە لەو زمانانەشدا هەر ( ی )یە • بە وێنە . وەك زمانی فارسیی ناوەڕاست[٢٢]و زمانی فارسیی نوێ[٢٣]و زمانی بلوجی[٢٤]و ••• هتد •

٦ ـ مامۆستا مەسعوود محەمەد ورد بۆ ئەوە چووە کە جێناوی لکاو « لەبەر زێدە گرنگی ئەو دەورەی پێی هەڵدەستێ لە ئاخافتندا ، ناشـــێ هیچ پیتێکی بفرتێ • لە پێش چاومانە ڕاناوە چالاکەکانی ( مـان ، تـان ، یـان ) لە هەموو حاڵێك لە هەموو ئەو لەهجانەدا کـــە بەکاریان دێنن وەك خۆیـــان دێنـــەوەو هیچ پیتێکیان لێ کـــەم نـاکـرێتـــەوە ، تێیـەکـەی ( دەکـەیت )یش ئـەگـــەر پیتێـــکی بنجی بـا دەبـوا ئـەویش وابـا • لـەمـــەش زیـاتـــر دەتـــوانـــم بڵێـــم : بـۆ دەبێ ڕێ هـــەبێ تێیەکی بفرتێو بگوترێ ( دەکەی ) کەچی ڕێی فرتـانی ( یێیەکە ) نەبێ ، خۆ زۆر ئاشکرایە دەنگی ( ی ) لە کوردیدا بە ئاسانی لەناودەچێ ! ئەگەر یێیەکە بنجی نەبا دەبوا ئەو بیێتە قوربانی تێیەکەو بگوترێ ( دەکەت ) لە جێگەی ( دەکەی ) هەر هەمان دەنگی ( ت ) لـە ڕابووردووی تێپەڕدا بـە هۆی ئەوەوە کە ڕاناوە هەرگیز تێچوونی بۆ نییە[٢٥] •

---

(٢٢) لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا « ی ( یهـ ) » جێناوی کـەسی دووەمی تاکە ( بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٨٤ ) •

(٢٣) بڕوانە : ذو النور ، دستور پارسی در صرفو نحـو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٢٨ •

(٢٤) لە هـــەردوو دیالێکتی ڕۆژهـــەڵاتو ڕۆژئاوای زمانی بلوجی‌دا ( ی ) جێناوی کەسی دووەمی تاکـە ( بڕوانـە : ڤ. ا. فرۆلۆڤا ، زمـانی بلوجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤٣ ـ ٤٤ •

٢٥) مەسعوود محەمەد ، ســـــووڕێکی خامــە بــە دەوری ( ڕاناو )دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغـدا ، ١٩٧٤ ، ل ٩١ •

ئەگەرچی هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆم بە دەســـــــتەوە نییە ، بەلاّم وا بیردەکەمەوە ، کە گرانیی هەندێ حاڵەتی گەردانیی - بەتـایبەتی بزوێن نەچوونە ســـەر بزوێن بەبێ ئاڵقـەی پەیوەندی - ئەو ( ت )ەی هێنابێتە کایەوە ... چونکە گەڕان‌و پشکنین ئەوە دەردەخەن ، زووتر لە حاڵەتی گەرداندا پەیدابووە ، وەك لە باری ئاسایی کرداردا .

وەك پێشتر وتمان زێوەر لە باری ئاساییدا تێکڕا ( ی )ی ووتوە ... بەلاّم لە هەندێ حاڵەتی گەردانیدا ( ت )ی خستۆتە سەر ( ی ) ، وەك :

**وا بەجێ‌ماوی لـە خێـڵ ناگەیتـە کوێســتانی مراد**
**کوردە سادەی غیرەتێ ، ( غیرەت ) نەوەی دینداری‌یە**
( زێوەر ، ل ١٢ )

**دەرحەق بـە « عیلم‌و مەکتـەب » ئەتۆ هاتیتە زبـان**
**« فیکری » بڵندی تۆیـە گەیشـــتۆتە « موشتەری »**
( زێوەر ، ل ٢٣ )

**... هتد .**

دەبینین زێـوەر ووتـویـە ( ناگـەیتـە ، هاتیتـــە ... ) نەیوتووە (ناگەییە ، هاتییە ...) ، بەلاّم لە بەرهەمی شاعیرانی پێش ئەوو فۆلکلۆری کوردی‌و نوویژی ئەمڕۆی گەلێ ناوچەی کرمانجیی خوارووودا لـــەو بارە گەردانی‌یەشدا ( ت )ەکە ناهێننە ناو کردارەکەوەو دەڵێن :

**بۆ پـارە حەیفـە خۆ دەکەیـە پوولی نـارەواج**
**بۆ پارویێکی نان ئەسەفە ڕوو دەکەی بە ســاج**
( مەحوی ، ل ٩٢ )

**ڕێوی گوتی : « مراوی ئەتۆ بۆ لـە بەحراندا هەر چێشتی خۆش دەخۆی ، گوێ نادەیە کەس ؟ »**
( تحفەی مظفریە ، ل ١٩٤ )

... هتد .

راســـته هیچ زیانێك لەوەدا نییە ئەو ( ت )ەی كۆتایی ( یت ) بـــە بەشێك لە جێناوەكە لە قەڵەم بدرێ ، هەروەهـــا زیانیش نییە بووتـــرێ زیادییەكی گەردانی‌یە . وەك مامۆستا مەســــــــعوود محەمــەد دەڵێ : « هەر لایێكیان بێ زمـانی كوردی زەرەرەی لێ‌ناكـەوێ »[٢٦] . بـەڵام سەپاندنی ڕای ئەوانەی ( ت )ەكە بە جێناو دادەنێن یاخود بە بەشـــێك لە جێناوەكەی دەژمێرن ، دووچاری چەند كێشەیەكمان دەكات :

١ ـ لە مەسەلەی جێناوەدا لە سەرێكەوە درز دەخاتە نێوان شـێوەی سلێمانی‌و بەشە دیالێكتەكانی سۆران‌و موكریانەوەو لە سەرێكی تریشەوە هەردوو دیالێكتی سەرەكیی كوردی ـ كرمانجیی خواروو و ژووروو ـ لەیەك دادەبڕێ .

٢ ـ بەم كارە مۆری هەڵە بە زوربەی زۆری ئەدەبی كلاسیكیمانەوە دەنێن ، چونكە ( ت )ەكەیان بەكارنەهێناوەو هەروەها ڕێبازێكی ڕەوان لە ڕەوتی ئەدەبی نوێمان كوێر دەكەنەوەو ئازادیی دەربڕین كـەم دەبێتەوە ، بەتایبەتی بە نیسبەت شاعیرەوە ، كە وا دەبێ كێش‌و قافیەی شــــیعری بەند دەبێ بە تێبردنی ئەو ( ت )ەوە[٢٧] .

**٢ ـ كەسی سێیەمی تاك :**

مامۆستا سەعید صدقی كابان دەربارەی جێناوی لكاوی كەســــی سێیەمی تاك دەڵێ : « بۆ ماضی لازم بۆ موفرەدی غائیب لە فیعلـەكـــەدا دەشاردرێتەوە ، ل ( ٢٩ ) ». وشـــــــەی ( نووســـــــت )ی بە نموونە هێناوەتەوە ... « ضەمیری حاڵ‌و ئیستقبال چە لازم چە موتەعەدی ...

(٢٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٩٣ .

(٢٧) هەمان سەرچاوە ، ل ٩٣ ـ ٩٤ .

( ێ ) موفرەدی غائیب لە بەعضـــــــێ فیعلا ( ئەلف ) وەکو ( دەخوا ، دەڕوا ) » ••• ( ل ۲۹ ) • بەم پێیە نووســـــەری ناوبراو سێ حالەتی جێناوی ( • . ێ ، آ )ی دیاری‌کردووە •

••• دە کوردستانی موکریـانیش لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا هەروەك مامۆستا کابان ئەو سێ جێناوەی دەست‌نیشان کردووە ( ل ٦٨ ) ، بەڵام لە وتاری « جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕستەی کوردیـــدا لـــە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و کرمانجیی ژووروودا »دا ئەوانـەی بـە کۆتایی کردار لەقەڵەم داوە ( ل ٤٠ )و تەنیا ( ێ )ی بە جێنـــاو دانـاوە ( ۲٤۱ – ۲٤۲ ) •

دە ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم لە وتاری « گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نووسانو پێکەوە نەنووسانەوە »دا ، تەنیا ( ێ )ی بە جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك ژماردووە ( ٤٥٤ – ٤٥٦ )و ئەوانی دی هەموو وەك کۆتایی کردار تەماشاکردووە ( ل ٤٥٣ – ٤٥٤ ) •

بـــە بـــاوەڕی مامۆســـــــتا تۆفیق وەهبی « آ ( ات ، اتین ) ، ێ ( ێت ، ێتین ) ، • » جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکن ( ل ۸۹ ) •

دە وریا عومەر ئەمین « • ، ات ، ێت »ی دیاری‌کردووەو ( ل۲٦۱ ) مامۆستا نووری عەلی ئەمین « ێ/ێت ، ت/ات ، • »ی دەست‌نیشـــان کردووە ( ل ۹۲ – ۹٥ ) • لـــە کتێبی « زمـانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی »دا ( ات ، ێت ، • » دانراوە ( ل ٥٦ ) • مامۆســـــتا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا ( ێت )ی نووسیوە ( ل ۱٥۹ – ۱٦۷ ) •

مامۆستا محەمەد مەعرووف فەتتاح لە وتاری « خۆیەتی لـــە زاری سلێمانی‌دا » ( ێ ، ێت ، ئا ، ئات )ی ناوبردووە ( ل ۱۷٤ ) • لیژنەی زمانی

کوردی کۆڕی زانیاری عێراق لـــە لاپەڕە ( ٣٢٧ )ی ژمـــارە ( ١٠ )ی گۆڤاری کۆڕدا ( ت ، یّت )ی دەســـــــتنیشان کردووەو لــە لاپەڕە ( ٣٢٩ )یشدا ( ان ، تیت )ی داناوە .

د. مەکەنزی وا ڕادەگەیەنیّ لە سلێمانیو وارماوا : ( یّ / یّت ) ؛ لە بنگردو پژدەرو موکریان : ( یّ/یّت ، ی/یت ) ؛ لە هەولێرو ڕەواندزو خۆشناوەتی ( ی/تن ، ت ) بۆ کەسی سێیەمی تاك بەکاردەبریّن .

د. کەریمی ئەیووبیو د. ئی. ئا. سمیرنـۆڤـا لـە بەشـە دیالێکتی موکریدا فۆرمی ( ٠ ، ە )یان دیاریکردووەو مامۆستا مەسعوود محەمەدیش هەر ( ٠ ، ە )ی داناوە .

د. کەریمی ئەیووبیو د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، هەروەك مامۆســـتا مەسعوود محەمەد فۆرمی دەستەی دووەمی جێناوەکانیان دیاریکردووە ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان نەهێناوەتەوەو وێڕای ئەوەش وایان لەقەڵەم داوە ، کە ( یّ )ش جێناوێکی لکاوی گشتییە ... بەڵام مامۆستا مەســـــعوود محەمەد نموونەو بەڵگەی تەواوی هێناوەتەوەو ( یّ )یش بە جێناو دانانیّ .

گەڕانو پشکنینو لێکدانەوە جێناوی لکاوی کەسی ســێیەمی تـاك بەم جۆرە دەردەخەن : ( ٠ ) ، ( ە ) .

أ ـ حاڵەتی دەرنەکەوتنی جێناو :

سەرنج دەری دەخا کە وا پێنج جێناوی ( م )ی کەسی یەکەمی تاك ؛ ( ی )ی کەسی دووەمی تاك ؛ ( ین )ی کەسی یەکەمی کۆ ؛ ( ن )ی کەسی دووەمی کۆ ؛ ( ن )ی کەسی سێیەمی کـۆ بـە ئاشــــکرا لەگەڵ کرداری تێنەپەڕی ڕابووردوو و ڕانەبوردووی تێپـــەڕو تێنەپـــەڕدا دەردەکەون ، هەرچی کەسی سێیەمە دەرناکەویّ .

خوێنەر کاتێ ( ێ/ێت ) ، ( ا/ات ) لە کۆتایی کرداری ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕەوە دەبینێو دەخوێنێتەوە ، کە زوربەی زمانەوانـــان بـــە جێناویان داناون . هەقیەتی بکەوێتە گومانەوە ... جـا بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانەو ساغکردنەوەی ئەو مۆرفیمانەو دەستنیشانکردنی حاڵـەتی کەسی سێیەمی تاك لەو کێشەیە دەکۆڵینەوە :

**مۆرفیمی ( ێ / یت ) :**

لەنێو ئەو کۆمەڵە مۆرفیمەدا ( ێ ) لـــە هەموویان چالاکتــرە ... لەبارەی ئەم مۆرفێمەوە سێ کێشە هەیە :

یەکەم : ئاید مۆرفێمەکە ( ێ )یە یان ( ێت )ە ؟ .
دووەم : ( ێ ) جێناوە یان زیادەی گەردانییە ؟ .
سێیەم : مەودای بەکارهێنانی چۆنە ؟ .

جگە لە هەندێ بەڵگەی تایبەتی ، هەروەها ئەوەی لەمەوپێش وتمان بۆ ئیسپاتکردنی ئەوەی ( ی ) جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تــاکـــە ، نەك ( یت ) ، دەکرێ زوربەی دووبارە بکرێتەوە :

١ ـ لە گەشتی تێکستی ئەدەبی کۆنو نوێی ناوچەی ســـلێمانیدا لێمان ئاشکرا دەبێ لـــە زوودا فۆرمی ( ێ ) بەکارهاتووەو زۆر درەنگ ( ێت ) بڵاوبووەتەوە . بۆ نموونە لە سەرپاکی شیعرەکانی نالیو شاعیرانی سەردەمی ئەودا وشەی ( ێت ) لە یەك دوو شوێندا بەکارهاتووەو کـەچی ( ێ ) لە سەدان شوێندا :

**وەها مەستی تەماشای چاوتــە « نالی » کـــە نازانێ**
**بە بێداری دەبینێ ، یا لە نەشئەی مەســـتیو خەودا**

( نالی ، ٨٩ )

**« نالی » خەبــەری بێ ئــەثەری غائیبـــە ، ئەمما**
**ناڵێکی حەزین دێ لــە موناجاتی ســـەحەردا**

( نالی ، ل ٨٢ )

که بەرەوپێش دەچین‌و دێینە سەردەمی مەحوی ئەوە دەبینین دیسان هەر ( ێ ) بەکارهێنراوە :

**هەتا ماوە دەبێ ئەشکی ندامەت داوەرێنی چاو**
**عەرەق ڕێتن نەبێ ، شەخصێ لە کاری خۆ خەجڵ چبکا ؟**

( مەحوی ، ل ١٤ )

**چاوی کوێ کە بەم غەزەلەم دوڕشناسی شیعر**
**کێ بێ دەڵێ ئەمەندە گوهەر وەرگرێ لە هیچ**

( مەحوی ، ل ١٠٠ )

وەك ئاشکرایە ، زێوەر ماوەیەك دوای مەحوی هاتووە ، ئەوەتە ئەمیش هەر لەسەر ڕێرەوی زوو ڕۆیشتووەو هەر ( ێ )ی وتووە :

**دیوێکە گیانی تیا نییە ئەگشێ بەچەشنی مار**
**بێ دەستو قاچو خوێنە بە بێ گۆشتو دەمار**

( زێوەر ، ل ٤٢ )

**هاتە سەربێ کە وا بچێ بۆ « ئاو »**
**بە لەپا کەوتە سەر هەمانە دڕاو**

( زێوەر ، ل ٧٩ )

بەڵێ لە بەرهەمی هەندێ لە نووسەرانی سەردەمی زێوەردا ناوەناوە فۆرمی ( ێت ) دەبینرێ‌و دواتریش پتر بەکارهاتووە •••• هاتنەکایەی ئەم ( ت )ە هیچ لەو ڕاستییە مێژووییە ناگۆڕێ ، کە ئەو مۆرفیمە لە سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا لە شێوەی ( ێ )دا بەکارهێنراوە •

٢ ـ تا ئێستاش نەك هەر لە گەلێ شوێنی دەوروپشتی سلێمانی ، هەروەها لە دوو ناوچەی گرنگ‌و بەرینی سەر بە دیالێکتی کرمانجیی خواروو ـ موکریان‌و سۆران چ لە زووداو چ ئەمڕۆ هەر (ێ) دیارە وەك :

**سەگ گوتی : « وا مەسەلەحەتە ، مشك كلكی خۆی لە ئەسپۆنێ وەربدا ، وەختێكی جووە دەنوێ ، بچێ كلكی خـۆی دە كـەپووی جوولەكەی بنێ ، دەپشمێ ، ئەنگوستیلەكە دەردەپەڕێ ...**

( تحفەی مظفریە ، ب ۱ ، ل ۱۹ )

**كیژۆلـەكـەی بەسـامو توندی خەزان**
**كـە پـەلامـاری دایـە بـاخو ڕەزان**
**دەشـكێنێ نەمـامی شـلكو تـەڕ**

( تاریكو ڕوون ، ل ۱٤۰ )

**لـە مـارانـڕا دێ مەحموود بەتەنێ**
**ـە جامـان خەنە لەسـمبڕان دەنێ**

( فۆلكلۆر ، ل ۳٦ )

**خوداوەنـدا دەخیلت بم هـەتـا كـەی حالەتم وا بێ**
**وەتەن داخی لەبۆ من بێ ، لە بۆ خەلكێ گولستانی**

( میهری ، ل ۲۹ )

۳ ـ ۰۰ەك گەلێ لـە زانایان پەنجەیـان بۆ درێژكردووەو[۲۸] وەك تێكستی تۆماركراو دەریدەخا لە دیالێكتی ژووروودا مۆرفێمی ناوبراو لە شێوەی ( ێ )دایە .

**یەكە ڕێوندایی هاتیە ، قەت نابیسێ گوتنانە**

( مەمێ ئالان ، ل ٥۳ )

**ئەوێ عەلی مەمەند دابوو زێڕاندنێ .**

( كوردۆ ، ل ۳٤ )

٤ ـ مۆرفێمی ( ێ ) ، كاتێ لەگەڵ جێناوێكی لكاوی دەسـتەی یەكەمدا دێ ، ( ت )ی لەگەڵ نایەت ، وەك :

---

(۲۸) بەوێنە ، بڕوانە : ( قەناتی كوردۆ ، هەمان سـەرچاوە ، ل ۱۹٥ ؛ چەركەزی بەكۆ ، هەمان سەرچاوە ، ل ۱۷۰ ) .

دامێ ، دامانێ ، بردمێ ، ناردمێ ، ناردمانێ ...

وا دیاره ئەو ( ت )ەی ئەمڕۆ بەدوا ( ێ )دا بەکاردێ ، شـــــێوەو شێوازی پەیدابوونی هەروەك ئەو ( ت )ە بێ ، كە لەدوا جێناوی ( ی )ی کەسی دووەمی تاکەوە دێت ... چونکە تێکستی کوردی نیشانی دەدا ، کە لە زوودا ئێجگار کەمبووەو دوایی لـــە حاڵەتی گەردانی کرداردا بـــە دەرکەوتووەو ئینجا بۆ باری ئاساییش پەرەی سەندووە ...

لێرەدا دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین ، د. مەکەنزی لە دوو ســـــەرەوە بەهەڵەدا چووە ، کـــە دەڵێ ( تن ) لـــە ناوچـــەی هەولێرو ڕەوانـدزو خۆشناوەتی(٢٩) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمە :

یەك ـ ئەو ( تن )ە جگە لەو ناوچانەی ئـەمـڕۆ ، کـــە د. مەکەنزی دەستنیشانی کردوون ، لە زووشدا لە گەلێ شوێنی تری کوردســـتاندا بەکارهاتوون . بۆ بەڵگەی ئەمە مامۆستا مەسعوود محەمەد نموونەی لـە ( شێخ ڕەزای تاڵەبانی )و ( مەلا وەسمان )ەوە هێناوەتەوە(٣٠) وا منیش بۆ پتەوکردنی ئەو ڕایە نموونەیەك لە ( نالی )یەوە دێنمەوە :

**مەهـ بە شەو هەڵدێ ، پەنا دەگرێتو دەنوێتن بە ڕۆژ**
**دا بگاتە سیرڕی بەچچەی پەرچەمو وەصـــفی برۆی**

( نالی ، ل ٦٩٤ )

دوو ـ لـــە ڕاستیدا ئـەو ( تن )ەش ، هەروەك ( ت ) زیـــادەی گەردانییەو شـــــایانی باسە مامۆســـــتا مەســـــعوود محەمەد ئەوەی ئیسپاتکردووە(٣١) .

---

(٢٩) بڕوانە : د. مەکەنزی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١١٠ .

(٣٠) بڕوانە : مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٠٣ .

(٣١) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٢ ـ ١٠٤ .

تا ئێرە ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ئەو پاشبەندە بە شـــێوەی ( ێ ) باوتربووەو باوە ، نەك بە شێوەی ( ێت ) ... ئنجا دێینە سەر لێکدانەوەی کێشەی دووەم : ( ێ ) جێناوە یان زیادیی گەردانیِیە ؟

ئێمە دەبینین هەر کردارێکی تێپەڕ یا تێنەپەڕ لە کاتی ڕانەبوردوودا کە جێناوە لکاوەکانی دەستەی دووەم وەردەگرن ئەگەر ڕەگی کردارەکە یاخود ڕاستتر ئەو بەشەی کردارەکە کە دەکەوێتە پێش جێناوەکە کۆتایی بە هەر دەنگێکی نەبزوێن هاتبێ ، چۆن بە ڕەوانیو ئاشـــکرایی جێناوی ( م )ی کەسی یەکەمی تاکو ( ی )ی کەسی دووەمی تاکو ( ین )ی کەسی یەکەمی کۆو ( ن )ی کەسی دووەمو سێیەمی کۆ وەردەگرن ، لە حاڵەتی کەســـی سێیەمی تاکدا مۆرفێمی ( ێ )ی پێوە دەنووسێ . بۆ نموونە :

**کـرادری تێنەپــەڕ**

| | | |
|---|---|---|
| | ( کەسی یەکەم ـ دەچم ، دەمرم ، دەبم | |
| تاك | ( کەسی دووەم ـ دەچی ، دەمری ، دەبی | |
| | ( کەسی سێیەم ـ دەچێ ، دەمرێ ، دەبێ | |
| | ( کەسی یەکەم ـ دەچین ، دەمرین ، دەبین | |
| کۆ | ( کەسی دووەم ـ دەچن ، دەمرن ، دەبن | |
| | ( کەسی سێیەم ـ دەچن ، دەمرن ، دەبن | |

**کـرداری تێپــەڕ**

| | | |
|---|---|---|
| | ( کەسی یەکەم ـ دەنووسم ، دەنێرم ، دەفرۆشم | |
| تاك | ( کەسی دووەم ـ دەنووسی ، دەنێری ، دەفرۆشی | |
| | ( کەسی سێیەم ـ دەنووسێ ، دەنێرێ ، دەفرۆشێ | |

**( کەسی یەکەم ـ دەنووسین ، دەنبڕین ، دەفرۆشین**
**کۆ ( کەسی دووەم ـ دەنووسن ، دەنبڕن ، دەفرۆشن**
**( کەسی سێیەم ـ دەنووسن ، دەنبڕن ، دەفرۆشن**(٣٢)

بێتو دەنگی پێش جیاوەکان بزوێنی ( وو )ش بێ دیسـان ڕوونو ئاشکرا مۆرفێمی ( ێ ) خۆی دەنوێنێ :

**( ١ ـ دەنووم ، دەیانگرووم**
**تاك ( ٢ ـ دەنووی ، دەیانگرووی**
**( ٣ ـ دەنوێ ، دەیانگرێ**(٣٣)

**( ١ ـ دەنووین ، دەیانگرووین**
**کۆ ( ٢ ـ دەنوون ، دەیانگروون**
**( ٣ ـ دەنوون ، دەیانگروون**

دەشێ بوترێ ، ئەگەر ئەو ( ێ )یە زیادەی گەردانی کردار بوایـە ، وا ڕێك لەگەڵ جێناوەکانی تردا نەدەهات ...

یاخود ئەگەر پێ لەسەر ئەوە دابگیرێ ، کـە ئـەو ( ێ )یە زیادەی گەردانی کردارە ، ئـەوە دەبێ بووترێ ( م ، ی ، ین ، ن ، ن )ش هـەر زیـادین .

ئەمە دواتر وەلاّم دەدەمەوە ، بەلاّم جارێ دەمەوێ ئەوە یادداشـت بکەم ، ئەگەر لە هەندێ باردا ( ێ ) باش دەرنەکەوت یان دەنگێکی تر لە جێی بینرا ، نەبێتە هۆی سەرلێتێکچوون .

(٣٢) ئەگەر کردارەکە ڕابوردووی بزریش بێ ، ئـەو مۆرفێمی (ێ/ێت)ە هەر دەردەکەوێ ، وەك :

دەنووسرێ(ێت ، دەنێررێ(ێتە) ، دەفرۆشرێ(ێت) .

(٣٣) لەم حالـەتـەدا لەبەر نەهاتنی بزوێن بەدوا بزوێنـدا ( وو ) دەبێتە کۆنسـۆنانتی ( و ـ W ) .

بۆ نموونه لەو کردارە ڕانەبوردووانەدا کـــە لـــە پێش جێناوەکانی ( م ، ی ، ین ، ن ، ن ) ەوە دەنگی ( ێ ) هەیە ، بە ڕەوانی جێناوەکان بە دوا ئەو ( ێ )یەوە دێن • وەك :

تاك
( ١ ـ دێم ، دەخنکێم ، دەسووتێم
( ٢ ـ دێی ، دەخنکێی ، دەسووتێی
( ٣ ـ دێ ، دەخنکێ ، دەسووتێ

کۆ
( ١ ـ دێین ، دەخنکێین ، دەسووتێین
( ٢ ـ دێن ، دەخنکێن ، دەسووتێن
( ٣ ـ دێن ، دەخنکێن ، دەسووتێن

بەلام کـە لە باری کەسی سێیەمی تاکدا کردارەکـان دەبنـە ( دێ ، دەخنکێ ، دەسووتێ ) هەر یەك ( ێ )یە ، ئەمە شـتێکی سەرسووڕهاوەر نییەو وەك ئاشـکرایە دوو بزوێنی ( ێ ) بەیەکەوە نـایـەنو یەکێکیـــان تێداچووە •

یاخـــود هەندێ جار هەر لە کاتی ڕانەبوردوودا ( ا ) لەبریتی ( ێ ) دەبینرێ ، وەك :

١ ـ ئەگەر دەنگی پێش جێناوەکە ( ە ) بێ • وەك :

تاك
( ١ ـ دەکەم ، دەبەم ، دەخەم
( ٢ ـ دەکەی ، دەبەی ، دەخەی
( ٣ ـ دەکـا ، دەبـا ، دەخا

کۆ
( ١ ـ دەکەین ، دەبەین ، دەخەین
( ٢ ـ دەکەن ، دەبەن ، دەخەن
( ٣ ـ دەکەن ، دەبەن ، دەخەن

٢ ـ ئەگەر دەنگی پێش جێناوەکان ( ۆ ) بوو[٣٤] . وەك :

تاك ( ١ ـ **دەخۆم ، دەڕۆم ، دەشۆم**
( ٢ ـ **دەخۆی ، دەڕۆی ، دەشۆی**
( ٣ ـ **دەخوا ، دەڕوا ، دەشوا**

کۆ ( ١ ـ **دەخۆین ، دەڕۆین ، دەشۆین**
( ٢ ـ **دەخۆن ، دەڕۆن ، دەشۆن**
( ٣ ـ **دەخۆن ، دەڕۆن ، دەشۆن**

هەرچی ئەم ( ا )یەیە ، ئەمیش شـــێوەی مۆرفێم ( نمط المورفیم ـ Allomorph )ی ( ێ )یەو دواتر لێی دەدوێین .

ئێستاش دێینە سەر کێشەی سێیەمی مۆرفێمی ( ێ ) ، کـــە باســـی مەودای بەکارهێنانێتی :

١ ـ لەگەڵ کرداری رانەبوردووی تێنەپەڕو تێپەڕدا دێ . وەك :

**تێنەپەڕ ـ دەچێ ، دەگەڕێ ، دەمرێ**
**تێپـــەڕ ـ دەنێرێ ، دەفرۆشێ ، دەگرێ**

٢ ـ دەچێتە سەرکرداری تێنەپەڕو تێپەڕ لە دۆخی نەهی ناصـــەریحدا ، وەك :

**تێنەپەڕ ـ نەچێ ، نەنوێ ، نەمرێ**
**تێپـــەڕ ـ نەنێرێ ، نەفرۆشێ ، نەنووسێ**

٣ ـ بە کرداری تێنەپەڕو تێپەڕەوە دەلکێ لە دۆخی فەرمان بـــە واتـــاو مەبەستی ئیزن خواستندا . وەك :

**تێنەپەڕ ـ بچێ ، بنوێ ، بمرێ**
**تێپـــەڕ ـ بنێرێ ، بفرۆشێ ، بگرێ**

---

(٣٤) لەم حاڵەتەدا نەك هەر پاشبەندەکە ( ا )یە ، بەڵکو ( ۆ )کەش دەبێتە ( و ـ W )ی کۆنسۆنانت .

٤ ـ به کرداری تێنەپەڕو تێپەڕی دەمی ڕابوردووی نزیکی ئینشـائی‌یەوە دەلکێ • وەك :

**تێنەپەڕ ـ چووبێ ، نووستبێ ، کەوتبێ**
**تێپـەڕ ـ خواردبێ ، فرۆشتبێ ، ناردبێ**

٥ ـ دەچێتە سەر کرداری تێپەڕ کە جێناوی دەســـتەی یەکـەمی لــە سەرەتاوە لەگەڵ هاتبێ • وەك :

**دەمانبێرێ ، دەمانفرۆشێ ، دەمانگەڕێ**

٦ ـ دەچێتە سەر هەندێ کرداری تێپەڕ ، کە جێناوێکی دەستەی یەکەمی پێوەبێ‌و وا چاو دەخەڵەتێنێ دەوری بەرکار ببینێ • وەك :

**دامێ ، دامانێ ...**
**کە داغی سینەمی دی ، دەردی دامێ**
**وتی : مۆرت هەیە ، صاحێب بەراتی**

( مەحوی ، ل ٢٩٨ )

**مۆرفیمی ( ا / ات )**

( ا ) شێوەی مۆرفێمی ( ێ )یەو تەنیا لەو حاڵەتـانەدا پەیدادەبێ ، کە ( ێ ) لە پاش هەندێ دەنگەوە ناتوانێ بێ ، دەنـا کـە دەنگەکـان دەگۆڕێن ( ێ ) دێتەوە • دەربارەی ( ا )ی شـێوەی مۆرفێمی ( ێ )یش هەروەها سێ کێشە هەیە :

ئایا پاشبەندەکە ( ا )یە یان ( ات )ە ؟ دووەم ـ ( ا ) جێنـاوە یـان زیادەی گەردانی‌یە ؟ ، سێیەم ـ مەودای بەکارهێنانی چۆنە ؟

بەشێك لەو بەڵگانەی پێشتر بۆ ئیســـپاتکردنی مۆرفێمی ( ێ ) هێنامانەوە ، ( ا )ی شێوەی مۆرفێمیشیان بەردەکەوێ :

١ ـ گەڕان لـە دیـوانی نالی‌و مەحـــوی‌و زێوەر ... دا ، ئـەوە دەردەخا ، کە تەنیا لە یەك دوو شوێندا نەبێ ـ ئەویش لەو شیعرانەدا کـە

به پیتی تێ کۆتاییان دێ - فۆرمی ( ات )یان بەکارنەهێناوە ، کەچی دەیانڕێژەی کەسی سێیەم کۆتایی بە ( ا ) هاتووە :

**دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بـە غونچـە**
**بـۆ دەعوەتی ماچی لـەبـە گۆیـا دەمی نـادا**

( نالی ، ل ٨٤ )

**ڕەم دەکا حەتتا لە میهرو مەهـ جونوون ئادابی عیشق**
**سـێبەری لێ بارە هەرکەس مەیلی تەنهایی بکـا**

( مەحوی ، ل ١٨ )

**هەواکەی ( شـاهۆ ) ئاوەکەی ( قەندیل )**
**لا ئـەبـا لـە کورد ئێشـی برینی**

( زێـوەر ، ل ٣٥ )

٢ - لە تێکستی فۆلکلۆری دوو ناوچەی موکریان‌و سـۆراندا دیسان هەر فۆرمی ( ا ) بەرچاو دەکەوێ . وەك .

**گوتیان : « نا ، مام ڕێوی تۆبەی‌کردووە ، هەموو ڕۆژێ بەرۆژووە ، لە ئاوی شەوێ پارێزێ دەکا ، دەچێتە حەججێ .**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ١٩٣ )

**هـەروا دەڕوا لەنجـەی دەکـا**
**سـەری مەمکی گـەمەی دەکـا**

( فۆلکلۆر ، ل ٥٢ )

... هتد .

وا پێ‌دەچێ ئەو ( ت )ەی ئەمڕۆ بەدوا ( ا )دا بەکاردێ شـێوەو شێوازی پەیدابوونی هەروەك ئەو ( ت )ە بێ کە لەدوا جێناوی ( ی )ی کەسی دووەمی تاك‌و ( ێ )ی کەسی سـێیەمی تـاکـدا دێ ... چونکە تێکستی کوردی نیشانی‌دەدا کە لـە زوودا ئێجگار کـەم بووەو دوایی لە حاڵەتی گەردانی کرداردا بەدەرکەوتووەو ئنجا بۆ باری ئاسـاییش پەرەی سەندووە .

دوای لێکدانەوەی فۆرمی مۆرفیمەکە ، ئنجا با بزانین ( ا ) جێناوە یان زیادی گەردانی‌یە •

پێشتر ئەوەمان باس‌کرد ، کە لە دوو حاڵەتی کاتی ڕانەبوردوودا ( ا ) بە دەردەکەوێ :

١ ـ ئەگەر دەنگی پێش جێناوەکان ( ە ) بێ •

لەم دۆخەدا جێناوی ( م )ی کەسی یەکەمی تاكو ( ن )ی کەسی دووەمو سێیەمی کۆ لەبەر ئەوەی نەبزوێنن بەڕەوانی بەدوا بزوێنی ( ە )دا دێن ، ( ی ـ ı )ی کەسی دووەمی تاكو ( ی ـ î ) سەرەتای ( ین )ی کەسی یەکەمی کۆ قۆرتیان بەوە دەڕەوێتەوە ، کە دەبن بە ( ی ـ y ) نەبزوێن • دەمێنێتەوە سەر ( ێ ) ، کە لە حاڵەتی کەسی سێیەمی تاکدا دەبێ بە شێوەیەك دەرکەوێ • لەبەر ئەوەی ( ێ ) نە دەتوانێ ببێ بە نەبزوێن‌و نە نزیکایەتی لەگەڵ ( ە ) هەیە ، بۆیە لەم بارەدا ( ا )ی شێوەی مۆرفیمی دێ • لەبەر ئەوەش کە ( د ) لە ( ا ) لاوازترە تێ‌دەچێ‌و کردارەکان دەبنە : ( دەکا ، دەبا ، دەخوا ••• ) •

٢ ـ ئەگەر دەنگی پێش جێناوەکان ( ۆ ) بوو •

هەر پێنج جێناوی ( م ، ی ، ین ، ن ، ن ) چۆن لە بەشی یەکەمدا هاتبوون لێرەشدا هەر بەو چەشنە دێن ••• هەرچی ( ێ )یە دیسان نە دەتوانێ بەدوا بزوێندا بێ‌و نە دەشێ ببێ بە نەبزوێن ، بۆیە سەرلەنوێ ( ا )ی شێوەی مۆرفیمی ( ێ ) سەرهەڵدەداتەوە • جا کە سەریش هەڵدەداتەوە کێشە هەر دەمێنێتەوە • ئەویش ئەوەیە ، کە بزوێن بەدوا بزوێندا نایەت ••• بەڵام قۆرت بەوە دەڕەوێتەوە ، کە بزوێنی ( ۆ ) دەبێ بە نەبزوێنی ( و ـ w ) • جیاوازی حاڵەتی یەکەم‌و دووەم لەوەدایە ، لە حاڵەتی یەکەمدا بزوێنی پێش ( ا ) کە تێداچووەو لە حاڵەتی دووەمدا بووە بە نەبزوێن •

بۆ ئەوەش کە پتر بیچەسپێنین کە ئەم ( ا )یە شێوە مۆرفیێمی (ێ)یە ، ئەگەر سەیری ئەو کردارانە بکەین کە ناومان بردن و ئەوانەیان لێ هەڵبژێرین کە لە گەردان کردنیاندا جێناوی دەستەی دووەم وەردەگرن ، دەبینین کاتێ لە دەمێ ڕابوردووی ئینشائیی نزیکدا کۆتاییان دەبێتە دەنگێکی نەبزوێن و ( ە ) یان ( ۆ ) نامێنێ ، ئەوسا ( ا ) نایەت و ( ێ ) خۆی دێتەوە • بەوێنە : کردبێ ، بردبێ ، خستبێ ، خواردبێ •••

لەبەرئەوەی ( ا ) لە هەموو ڕوویەکەوە لە ( ێ ) کزترە ، بۆیە مەودای بەکارهێنانیشی تەسکترە ، بەڵام لەو مەیدانانەدا کە تێیاندا بەکاردەبرێ ، بەشی مەیدانی ( ێ )ن :

١ ـ لەگەڵ کرداری ڕانەبوردووی تێنەپەڕو تێپەڕدا دێ :

**تێنەپەڕ ـ دەڕوا •••**
**تێپەڕ ـ دەخوا •••**

٢ ـ دەچێتە سەر کرداری تێنەپەڕو تێپەڕ لە دۆخی نەهی ناصەریحدا :

**تێنەپەڕ ـ نەڕوا •••**
**تێپەڕ ـ نەخوا •••**

٣ ـ بە کرداری تێنەپەڕو تێپەڕەوە دەلکێ لە دۆخی فەرمان بە واتاو مەبەستی ئیزن خواستن :

**تێنەپەڕ ـ بڕوا •••**
**تێپەڕ ـ بخوا •••**

٤ ـ دەچێتە سەر کرداری تێپەڕ کە جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە بێ ( بە مەرجێ لە سەرەتاوە هاتبێ ) :

**دەمخوا ، دەمانخوا •••**
**دەمشوا ، دەمانشوا •••**

نەبوونی پاشبەند :

هەموو کردارە تێنەپەڕەکان لە هەریەکێ لە چاوگی دالیەوە یان تێیەوە یان ئەلفییەوە یان واوییەوە یان یێیەوە بن ، لە کاتی ڕابوردووی ئیخباریو ئینشائی ڕەبەق یان بەردەوام یان دووردا[٣٥] لە حاڵەتی کەسی سێیەمی تاکدا نە جێناوو نە زیادەی گەردانی وەرناگرن • بەوێنە ( مردن ، نووستن ، گەڕان ، چوون ، فڕین ) :

أ - ڕابوردووی ئیخباری :

١ - ڕبوردووی ئیخباریی ڕەبەق :

مرد ، نووست ، گەڕا ، چوو ، فڕی

٢ - ڕابوردووی ئیخباریی بەردەوام :

دەمرد ، دەنووست ، دەگەڕا ، دەچوو ، دەفڕی

٣ - ڕابوردووی ئیخباریی دوور :

مردبوو ، نووستبوو ، گەڕابوو ، چووبوو ، فڕیبوو

ب - ڕابوردووی ئینشائی :

١ - ڕابوردووی ئینشائیی ڕەبەق :

مردبا ، نووستبا ، گەڕابا ، چووبا ، فڕیبا

---

(٣٥) ئێمە لێرەدا سێ جۆری ڕابوردووی ئیخباریو ئینشائیمان دیاریکردو جۆری چوارەم کە ڕابوردووی نزیکە ، ناومان نەبرد ، چونکە ڕابوردووی نزیك لە حاڵەتی ئینشائیدا ، وەك پێشتر باسمانکرد پاشبەندی ( ێ ) وەردەگرێ ، وەك ( مردبێ ، نووستبێ ، گەڕابێ ، چووبێ ، فڕیبێ ... ) . لە حاڵەتی ئیخبارییشدا وەك دواتر لێی دەدوێین جێناوی ( ە ) وەردەگرێ ، وەك : ( مردووە ، نووستووە ، گەڕاوە ، چووە ، فڕیوە ... ) .

٢ ـ ڕابوردووی ئینشائیی بەردەوام :

بمردبایە . بنووستبایە ، بگەڕابایە ، بچووبایە ، بفڕیبایە
( بمردایە . بنووستایە ، بگەڕایە ، بچوایە ، بفڕییایە • )

جێناوی کەسی سێیەمی تاکو زێدەی گەردانی لە ڕێژەی ڕابوردووی تێپەڕی ئیخباریو ئینشائی ڕەبەق یا بەردەوام یان دووردا دەرناکەوێت • وەك :

أ ـ ڕابوردووی ئیخباری :

١ ـ ڕابوردووی ئیخباریی ڕەبەق :
نووسرا . کوژرا •••

٢ ـ ڕابوردووی ئیخباریی بەردەوام :
دەنووسرا ، دەکوژرا •••

٣ ـ ڕابوردووی ئیخباریی دوور :
نووسرابوو ، کوژرابوو •••

ب ـ ڕابوردووی ئینشائی :

١ ـ ڕابوردووی ئینشائیی ڕەبەق :
نووسرابا ، کوژرابا •••

٢ ـ ڕابوردووی ئینشائیی بەردەوام :
بنووسرابایە ، بکوژرابایە •••
( بنووسرایە ، بکوژرایە ••• )

٣ ـ ڕابوردووی ئینشائیی دوور :
نووسرابووبایە ، کوژرابووبایە •••
( نووسرابووایە ، کوژرابووایە ••• )

هەندێ کرداری تێنەپەڕ هەیە لە کاتی ڕانەبوردوودا کـــە بۆ کەسی سێیەمی تاك بەکاردێن ، زیادەی گەردانیی ( ی )یان دەچێتەسەر • وەك :

دەژی ، دەگری •••

ئەگەرچی زوربەی نووسەران ئەو ( ی )یەشـــیان بە جێناوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەم داناوە ، بەڵام بەهەڵەدا چوونو هـەر ئـەو نموونانەی بۆ جێناو نەبوونی ( ێ//ێت ، ا//ات ) هێنـــاومانەتەوە ، دەتوانن ببنە بەڵگەی ڕەتکردنەوەی جێناو نەبوونی ( ی )یش •••

ب – جێناوی ( ە ) :

نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ( جگە لە مامۆستا نووری عەلی ئـەمین بەپێی بۆچوونی زووی‌و مامۆستا مەســـعود محەمەد ) ، بزوێنی ( ە )ی کۆتایی ڕستەی وەك : « دارا مەردە » ؛ « ئەو زیرەکە » ؛ « ئەو کوردە » ؛ « خۆر بلندە » ••• یـــان بـە کـرداری « بوون ( فعـــل الکینونـــە – Verb to be ) داناوە »[٣٦] •

بەڵێ مامۆستا مەسعوود ڕاســـت بۆی چووە ، کە دەڵێ لـەم جۆرە ڕستانەدا « کوا فیعل ؟ دەزانین هەموو فیعلێك لە خودی خۆیدا ، واتە لە ناوەرۆك‌و واتای وشـــــــەکەیدا ، دوو ڕەگەزی هەیە ، کە هەر خۆیان ناوەرۆك‌و واتای فیعلەکە پێكدێنن • ئەم دوو ڕەگەزە ( کات‌و ڕوودان )ن هەرچی فیعلی جیهان هەیە بیانهێنەوە بە نموونەی دەمەتەقە ، تاکێکیان بێ ئـــەم دوو ڕەگەزە نیەو ئیمکانیش نیـــە هەبێ » ( ســـــــــــووڕێکی خامە ••• ل ١١١ ) ••• بە دوا ئەمەدا مامۆستا مەســـعوود بە چەندین بەڵگەی واقیعی‌و زمانەوانی ئەوە ئیسپاتدەکا ، کە ئەو ڕســـتانە کات‌و ڕوودانیان تێدا نییە ( ل ١١٤ – ١١٨ ) •

---

(٣٦) بڕوانە بەرهەمەکانی : تۆفیق وەهبی ، نووری عەلی ئەمین ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، عەبدوڵلا شالی ... و گەلێکی‌تر .

که دەوترێ « دارا مەردە » ••• تەنیا ڕاســـــتییەك باس‌کراوەو مەبەست ئەوە نییە ( تازە دارا بۆتە مەرد ) تا بیرمان بۆ ڕوودان بچێ • لە ڕســـــتەکەدا مەردایەتی ئەو ڕووداوێکی نوێ نییە کـــە پێشتر بوونی نەبووبێ ••• بەڵام بێتوو بووترێت « ئەو مەرد بوو » ، ئەوەدەم مەردایەتی ئەو دەبێ بــە ڕووداوێك لــە کاتی ڕابوردوودا کــە واتــە لێرەدا واتــای تەجریدی مەردایەتی بـــە هۆی کرداری ( بوو )ەوە دەبێتـــە ڕوودان • هەروەهاش لە « نووسنووم » یـا « نووستووە »دا جێناوە لکاوەکـــان بە هۆی ڕێژەیێکی کرداری « نووســـتن »ەوە دەبنـــە ڕاگەیێنی واتــای « ڕوودان » ، بەڵام هیچ کامێك لـــە جێناوەکان لـــە خودی خۆیانـــدا ڕوودانیان تێدا نییە •

مامۆستا مەسعوود محەمەد لە دیاری‌کردنی هۆی بەهـەڵـــە چوونی زمانناسان لەم کێشەیەدا باش نیشانی پێکاوە ، کە دەڵێ : « بەڕاســــتی ئەوەی زیهن دەخەڵەتێنێو بەرەو هێندێی دەبـا وا بزانێ لـــە ڕســـتەی ( مەردم ، مەردە )دا ڕاناو هەبێ ، ئەو ( حکمو اســـنادە )یە کـــە ڕاناوە چالاکەکە ڕای‌دەگەیەنێو بەوەدا بزوتنەوەیێکی واتایی پەیـــدادەبێ لـــە ڕستەکەدا کــە هەرگیز لە وشەی ساردو سڕو بێتاوو تین پەیدانابێ ئەگەر هەزاریشی بەدوایەکەیدا قەتارکەی • کـــە بڵێی ( لێرەوە تـا کـەرکووك دەشت )و وەستای لە قسەکەت ، چەند لاشەیێکی وشەو ئەمڕازت بــەدوا یەکدیدا ڕیزکردووە بێ‌گیانو بزووتنەوە ، بـەڵام کـــە گوتت ( ••• تـا کەرکووك دەشتە ) ئـ ئەم بزوێنەی کۆتایی ڕستەکە گیاتێكو جموجۆڵێك دەخاتە بەر وشەکانو ڕەگەزێکی تازە دێنێتە ناوەرۆکی ڕستەکەوە کــــە بریتیە لە بڕیاردانی ( دەشـــــتایەتی ) مەودای میـــانی ئێرەو کەرکووك •

فامرانەوەی ئەو بڕیارە لە ڕستەکەدا وا دەکا خەیاڵ بۆ واتای ڕووداو بڕوا ، کەچی هیچ شتێك لە نەبوویەوە پەیدانەبووە ، واتە ڕووداو لە گوتەکەدا نیە ، لە ڕاگەیاندنی حەقیقەت بەولاوە ئەو بڕیار ( حکم و اسنادە )ە لـە فیعلیشدا هەیە سەرەڕای کە کاتو ڕووداویش هەیە ، واتە لە ڕستەی ( نووسی ) ڕووداوی ( نووسین ) لە کاتی ( ڕابوردوو ) دوو ڕەگەزی ڕەسەنی فیعلەکەی (نووسین)ن لە کاتی ڕابردوودا قەوماوە•بەڵام لە ڕستەی ( دارا مەردە )دا لە غەیری بڕیاری هەبوونی مەردایەتی کە هێزوپێزی گوتەکەیە ، نە ڕووداو نە چ کاتێك مەبەستی گوتەکەیە ، کە مەبەست نیە لێشی نافامرێتەوە » ( ل ١١٤ ـ ١١٥ ) •

لەسەر بناغەی ئەو بەڵگانەی مامۆستا مەسعوود محەمەدو هەندێ بۆچوونی خۆم . ئەوەمان لێكدایەوە کە ( ڕووداو ) لە ڕستەی وەك « دارا مەردە » ، « پەروین زیرەکە » ، « ئەو کوردە »دا نییە ••• ئێستاش بابزانین ( کات ) لەم ڕستانەدا هەیە یا خود نییە ؟

ئێمە کە دەڵێین « پەروین زیرەکە » ، « پیرەمەگروون شاخێکی بەرزە » ، « دڵ لای چەپە » ، شیر خۆشە » ، « کۆتر مەلێکی جوانە » ، « بەرد ڕەقە » ••• لەم ڕستانەو سەدانی تری وەك ئەواندا بە بیری کەسدا نایەت بیربکاتەوە پەروین کەی زیرەك بووە ؟ شاخی پیرەمەگروون ئێستا یان لەزوودا بەرزبووە ؟ دڵ لە کەیەوە لای چەپەوەیە ؟ شیر لە چ دەمێکەوە زانراوە خۆشە ؟ کۆتر لە چ زەمانێکدا مەلێکی جوان بووە ؟ بەرد تازە ڕەق بووە یان لە دێر زەمانەوە هەروا بووە ؟ ••• ئاخێوەر لەم وتانەدا مەبەستی دەربڕینی ڕاستی‌یەکە بێ ئەوە ئاگای لە دوێنێو ئیمڕۆو سبەینێ هەبێو بێ ئەوە ڕستەکەش خۆی لە خۆیدا چ کاتێکی دەستنیشان

کردبێ « کە دەڵێی ( هەنگوین شیرینە ) ڕاستیێکت گوتووە لە هەموو کاتدا هەر ڕاستە ، واتە لەوەتەی هەنگوین هەبووە هـــەر شـــــیرین بووە ، ئێستاکەش شیرینەو لە دواڕۆژیشدا هەر شیرین دەبێ ، خۆ کەسیش ناڵێ لەم ڕستەیەدا سێ کات کۆبۆتەوە بەجارێ » ( ل ١١٧ ) •

مەبەست لە بوونی کات لە وشە یاخود ڕستەدا ئەوەیە لـــە خودی وشەکە یان پێکهاتنی ڕستەکەدا کات هەبێ ، نەك لە دەرەوە پێویست یـان ڕاگەیاندنی حاڵ یان هەر شتێکیتر هێنابێتی ، ئەگەر تەنها تەماشـــــای واتاو ناوەڕۆکی وشەو پێکهاتنی ڕســــتە نەکەینو گوێ ڕاگرین دەنگو سەدای دەرەکی داخوا کاتمان بۆ تێدەخوێنێتەوە یان ناخوێنێتەوە ، هەموو کردارەکان تێکەڵ بەیەکتر دەبنو شیرازەی باسی زانســـتی زمـــان لەبەر یەکتر هەڵدەوەشێ •••

« لە ڕستەی وەك ( دارا مەردە ، ترێ میوەیە ) کە وا مەبەســــت دەرخستنی باوەڕێك وەیا ڕاستی‌یەکی ( مطلق )ەو هیچ یەك لە بەشـــەکانو کەرتەکانی ڕستەکان لە خۆیانەوە پەنجە بۆ کاتێکی دیارکراو درێژناکەن ، هەر ( اعتبار )ێکی دەرەکی بێو کـــات ( تحدید )کا بۆ ئەم باوەڕە وەیـا ڕاستییە ، بایەخی پێ نادرێ لە گۆشەی نیگای ڕێزمانو زانستی زمانەوە • کـــە لـــە عەینی ڕســــتەکەدا کـات پـەیـدانەبوو ئیتر ئەوا کات نیە » ( ل ١١٨ – ١١٩ ) •

بەم پێیە دەردەکەوێ کە بزوێنی ( ە )ی کۆتایی ڕســــــتەی وەك « دارا مەردە » ؛ « ئەو کوردە » ؛ « پەروین زیرەکە » ••• کردار نییە ، چونکە ڕوودانو کاتی تێدا نییە •

من وای بۆ دەچم ( ە ) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەمەو لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بەکاردێ :

١ ـ بە کرداری تێنەپەڕەوە دەلکێ ، کە لە دۆخی ڕابوردوو و نزیکی ئینشائی‌دا بێ ، وەك :

**تاك** ( **کەسی یەکەم ـ نووستووم ، گەڕاوم ، چووم ، فڕیوم**
( **کەسی دووەم ـ نووستووی(یت) ، گەڕاوی(یت) ، چووی(یت) ، فڕیوی(یت)**
( **کەسی سێیەم ـ نووستووە ، گەڕاوە ، چووە ، فڕیوە**

**کۆ** ( **کەسی یەکەم ـ نووستووین ، گەڕاوین ، چووین ، فڕیوین**
( **کەسی دووەم ـ نووستوون ، گەڕاون ، چوون ، فڕیون**
( **کەسی سێیەم ـ نووستوون ، گەڕاون ، چوون ، فڕیون**

٢ ـ لە ڕستەی بێ‌کرداردا دەچێتە سەر :

أ ـ ناو :

| | | |
|---|---|---|
| **من کوردم** | ؛ | **من خەڵکی هەولێرم** |
| **تۆ کوردی(یت)** | ؛ | **تۆ خەڵکی هەولێری(یت)** |
| **ئەو کوردە** | ؛ | **ئەو خەڵکی هەولێرە** |
| **ئێمە کوردین** | ؛ | **ئێمە خەڵکی هەولێرین** |
| **ئێوە کوردن** | ؛ | **ئێوە خەڵکی هەولێرن** |
| **ئەوان کوردن** | ؛ | **ئەوان خەڵکی هەولێرن** |

ب ـ ئاوەڵناو :

| | | |
|---|---|---|
| **من زیرەکم** | ؛ | **من کوردێکی نەبەردم** |
| **تۆ زیرەکی(یت)** | ؛ | **تۆ کوردێکی نەبەردی(یت)** |
| **ئەو زیرەکە** | ؛ | **ئەو کوردێکی نەبەردە** |

| | | |
|---|---|---|
| **ئێمە زیرەکین** | ؛ | **ئێمە کوردێکی نەبەردین** |
| **ئێوە زیرەکن** | ؛ | **ئێوە کوردێکی نەبەردن** |
| **ئەوان زیرەکن** | ؛ | **ئەوان کوردێکی نەبەردن** |

ج ـ زوربەی جێناوەکان :

١ ـ جێناوی کەسیی جودا :

| | | |
|---|---|---|
| **من منم** | ؛ | **من لە تەنیشت تۆوەم** |
| **تۆ منی** | ؛ | **تۆ لە تەنیشت منەوەی(یت)** |
| **ئەو منە** | ؛ | **ئەو لە تەنیشت منەوەیە** |
| **ئێمە ئێوەین** | ؛ | **ئێمە لە تەنیشت تۆوەین** |
| **ئێوە ئێمەن** | ؛ | **ئێوە لە تەنیشت منەوەن** |
| **ئەوان ئێوەن** | ؛ | **ئەوان لە تەنیشت منەوەن** |

٢ ـ جێناوی خۆیی :

| | |
|---|---|
| **من خـــۆم** | **ئێمە خۆین** |
| **تۆ خۆی(یت)** | **ئێوە خۆن** |
| **ئەو خۆیـــە** | **ئەوان خۆن** |

٣ ـ جێناوی پرسیار :

| | | |
|---|---|---|
| **من کێم** | ؛ | **من کامەم** |
| **تۆ کێی(یت)** | ، | **تۆ کامەی(یت)** |
| **ئەو کێیە** | ؛ | **ئەو کامەیە** |
| **ئێمە کێین** | ، | **ئێمە کامەین** |
| **ئێوە کێن** | ؛ | **ئێوە کامەن** |
| **ئەوان کێن** | ؛ | **ئەوان کامەن** |

٤ ـ جێناوی نیشانه :

| | |
|---|---|
| من ئەمەم | ئێمە ئەمەین |
| تۆ ئەمەی(یت) | ئێوە ئەمەن |
| ئەو ئەمەیە | ئەوان ئەمەن |

٥ ـ جێناوی نادیار :

| | |
|---|---|
| من کەسێکم | ئێمە کەسێکین |
| تۆ کەسێکی(یت) | ئێوە کەسێکن |
| ئەو کەسێکە | ئەوان کەسێکن |

٦ ـ جێناوی نەفی :

| | |
|---|---|
| من هیچم | ئێمە هیچین |
| تۆ هیچی | ئێوە هیچن |
| ئەو هیچە | ئەوان هیچن |

د ـ دەچێتە سەر ژمارە :

| | |
|---|---|
| من یەکم | ئێمە چوارین |
| تۆ یەکی(یت) | ئێوە چوارن |
| ئەو یەکە | ئەوان چوارن |

هـ ـ دەچێتە سەر چەند جۆرێك لەئاوەڵکردار :

١ ـ ئاوەڵکرداری شوێن :

| | | |
|---|---|---|
| من لێرەم ؛ | من لە سەرەوەم ؛ | من لە ژوورەوەم |
| تۆ لێرەی(یت) ؛ | تۆ لە سەرەوەی(یت) ؛ | تۆ لە ژوورەوەی(یت) |
| ئەو لێرەیە ؛ | ئەو لە سەرەوەیە ؛ | ئەو لە ژوورەوەیە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئێمە لێرەین | ؛ | ئێمە لە سەرەوەین | ؛ | ئێمە لە ژوورەوەین |
| ئێوە لێرەن | ؛ | ئێوە لە سەرەوەن | ؛ | ئێوە لە ژوورەوەن |
| ئەوان لێرەن | ؛ | ئێوە لە سەرەوەن | ؛ | ئێوە لە ژوورەوەن |

... و هتد .

ئێستاش دێینە سەر باس‌کردنی ئەو بەڵگانەی کە جێناو نەبوونی مۆرفێمی « ێ( ێت )//ا ( ت ) ، ی » بە ئاسانی پێ ئیسپات دەکرێ :

لە سەرەتادا لە رەت‌کردنەوەی بە جێناودانانی ( ت )ی کۆتایی ئەو فۆرمانە دەدوێین .

هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بۆ بەڵگەی جێناوبوونی دەنگی ( ت )ی کۆتایی کردارەکانی ، وەك : ( دەچێت ، دەڕوات ... ) ، دەڵێن لەبەر ئەوەی ئەو دەنگە لە کاتی بەکارهێنانی پاشگری ( ەوە )دا بەدیار دەکەوێتەوە ـ واتە هەرچەند دەشێ بگوترێ ( دەچێ ، دەڕوا ... )، بەڵام کە ویستمان پاشگری ( ەوە )یان بەدوادا بهێنین ، دەبێ دەنگەکەی ( ت ) زیندوو بکەینەوەو بڵێین ( دەچێتەوە ، دەڕواتەوە ... ) . گوایە بەمە ئیسپات دەبێ کە دەنگی ( ت ) جێناوە[37] .

بەتەواوی ڕام لەگەڵ ڕای مامۆستا مەسعوود محەمەددا دەگونجێ ، کە ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی ڕواڵەت پەرستی‌یە چ پێوەندی بە قووڵایی زمان‌و دەستووری ئاخاوتنەوە نییە . « ئەو کەسەی خەیاڵی بۆ دیاردەی هاتنەوەی ئەم ( ت )ە چووە دەبوو لەگەڵ ئەوەدا خەیاڵی بۆ کەسی دووەمی تاکیش چووبایە لە فعلەکانی وەك : ( دەخۆیت ، دەکەیت ، دەچیت ) کە لەواندا بەشی زۆری کورد دەڵێن ( دەخۆیەوە ، دەکەیەوە ، دەچیەوە ، دەنوویەوە ... ) چونکە لەمەدا بۆمان معلوم دەبێ بەنیسبەت ڕاناوی کەسی دووەمەوە جگە لە دەنگی ( ت ) کە لە کۆتایی ڕاناوەکە هەیە دەنگێکی تری ( ی )ش هەیە ئەم پاشگرەی ( ەوە ) خۆی پێوەبگرێت

---

(٣٧) بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان‌و زانستەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ( ڕای د. نەسرین فەخری ، ل ٥٠ ).

بۆیە بوو نوانرا دەنگەکەی ( ت ) لە فعلەکانی ( دەکەیت ، دەڕۆیت ••• ) بسوێتو ڕاناوە ڕاستەکییەکەی ( ی ) بمێنێتەوە کە دەزانین ئەم ( ی )یە هەرگیز سوانی بۆ نییە ، واتە وەك دەنگەکەی ( ت ) نییە بســـــوێتو نەسوێت • لە حاڵەتی فعلی ئایندەی کەسی سێیەمی تاکدا چ ڕاناوی وەك ( یت ) وجودی نییە تاکو بتوانین لەوێشدا دەنگە سواوەکان بە ســواوی بهێڵینەوەو پاشگرەکە بەو بەشەی ڕاناوەوە بلکێنین کە وا وەك (ی)ەکەی کەسی دووەمی ماوەتەوەو ســــــوانی بەســــەردا نەهاتووە • لە فعلی ( دەڕۆیت - دەڕۆی ) ڕاناوەکە دەنگی ( ی )ەو دەتوانی بڵێی ( دەڕۆیەوە ) بەڵام لە فعلی ( دەڕوا ) نە ڕاناو هەیە نە دەنگێکی کۆنســــۆنانت هەیە پاشگری ( ەوە ) خۆی پێوە بگرێتەوە بۆیەیە دەبێ دەنگێکی کۆنسۆنانت بێ‌و ببێتە ئاڵقەی پێوەندی •

هاتنەوەی دەنگی ( ت ) بۆ پێشایی ( ەوە ) صــــیفەتێکی تـازە بەو ( ت )ە نابەخشێتو نایکاتە ڕاناو • ئەم دەنگە بەر لـە قرتانو سوانی چی بوو بێت بە هەمان صیفەتەوە دەگەڕێتەوە ، واتە ئەگەر شـــێوەو زیادەی تصریف بێت ، هەروەها دێتەوە ، کاتێك پێی دەڵێن ئەم دەنگە بـە ڕاناوی دێتەوە بۆ دوای پاشگری ( ەوە ) کە ئیسپاتمان کردبێت لە بنەڕەتدا ڕاناو بووە » ••• « لە زۆر جێگەی کوردستاندا ئەم پاشگرەی ( ەوە ) کە بـە دوا فعلی ئەلفیــــــدا دێت دەنگێکی ( ی ) ناوەندی دەهێنن بۆ ئەوەی پاشگرەکە خۆی پێوە بگرێت کەسیش نەیگوتوە ئـەم دەنگە ناوەنـدییـە ڕاناوە وەیا بەشێکە لە بەشەکانی تری ئاخاوتن •

بە نموونە سەیری ئەم ڕستانە بکە : ( هەڵســـتا ـ هەڵســـتایەوە ، گەڕا ـ گەڕایەوە ••• » ( بڕوانە : چەند حەشـــارگەیێکی ڕێزمـــانی کوردی ، ل ٨٦ ـ ٨٨ ) •

وردبوونەوەو سەرنجڕاگرتن ، بەڵگەی دیکەی وەك ئەمانە پەیدادەکەن • بە وێنە تەماشاکردنێکی ڕێژەی هەندێ کردار کە جێناوی ئاشکرایان پێوەیە، لەگەڵیشیان زیادەی ( ت ) هاتووە ، بە ئاسانی جێناونەبوونی ( ت ) ئیسپات دەکات ••• ئەگەر نووسەر هەر لە چوارچێوەی ( چووبێ – چووەتەوە – چوویێتەوە )دا بمێنێتەوە ، ئەوە ( ت )ی لێ دەبێتە جێناوی کەسی سێیەم ، بەڵام پێتوو کەمێ لەو چوارچێوە تەسککە دەرچێ‌و بڕوانێتە حاڵەتەکانی ( چوومەتەوە – چووینەتەوە – چوونەتەوە ••• چووبمەتەوە – چووبینەتەوە – چووبنەتەوە ••• ) دەبینێ لەگەڵ جێناوەکانی ( م )ی کەسی یەکەمی تاك‌و ( ین )ی کەسی یەکەمی کۆو ( ن )ی کەسی دووەم‌و سێیەمی کۆدا هەمان ( ت ) هاتۆتەوە بۆی ڕوون دەبێتەوە نە لە ڕووی واتاوەو نە لە ڕووی دەستووری زمانەوە ئەو ( ت )ە نە جێناوەو نە دەوری جێناو دەبینێ ، بەڵکو زیادەیەکی گەردانی‌یە •••

ئنجا لەو بەڵگانە دەدوێین ، کە جێناو نەبوونی ( ێ//ا )و ( ی ) یان پێ ئیسپات دەکرێ‌و نیشانی‌دەدەن ، کە کەسی سێیەمی تاکی کرداری ڕابووردوو تێنەپەڕو ڕانەبوردووی تێنەپەڕو تێپەڕ جێناوی ئاشکرایان نییە :

١ – ئێمە وەك دەزانین جێناوەکانی دەستەی دووەم لەگەڵ ڕانەبوردوو و ڕابوردووی تێنەپەڕدا ئاشکرا دەردەکەون وەك :

أ – ڕانەبوردوو :

| | | | |
|---|---|---|---|
| دەچم ، دەڕۆم | ( م ) کەسی یەکەم | ) | |
| دەچی(یت) ، دەڕۆی(یت) | ( ی ) کەسی دووەم | ) | تاك |
| دەچێ(ێت) ، دەڕوا(ات) | ( • ) کەسی سێیەم | ) | |

دەچین ، دەڕۆین ( ین ) کەسی یەکەم )
دەچن ، دەڕۆن ( ن ) کەسی دووەم ) کۆ
دەچن ، دەڕۆن ( ن ) کەسی سێیەم )

ب - ڕابوردوو :

تاک

چـووم ، دەچـووم ، چـووبـووم ... | (م) کەسی یەکەم
ڕۆیشتم ، دەڕۆیشتم ، ڕۆیشتبووم ...

چـووی(یت) ، دەچـووی(یت) ، چـووبـووی(یت) ... | (ی) کەسی دووەم
ڕۆیشتی(یت) ، دەڕۆیشتی(یت) ، ڕۆیشتبووی(یت) ...

چـوو ، دەچـوو ، چـووبـوو ... | (٠) کەسی سێیەم
ڕۆیشت ، دەڕۆیشت ، ڕۆیشتبوو ...

کۆ

چووین ، دەچووین ، چووبـووین ... | ( ین ) کەسی یەکەم
ڕۆیشتین ، دەڕۆیشتین ، ڕۆیشتبووین ...

چـوون ، دەچـوون ، چـووبـوون ... | ( ن ) کەسی دووەم
ڕۆیشتن ، دەڕۆیشتن ، ڕۆیشـتبوون ...

چـوون ، دەچـوون ، چـووبـوون ... | ( ن ) کەسی سێیەم
ڕۆیشتن ، دەڕۆیشتن ، ڕۆیشـتبوون ...

لە بەشی ( أ )یش و ( ب )یشدا پێنج جێناوی ( م ، ی ، ین ، ن ، ن ) ئاشکرا دیارن و هیچ گومانێك لە جێناوبوونیاندا ناکرێ ... هەرچی حاڵەتی کەسی سێیەمی تاکە کە لە کاتی ڕانەبوردوودا لە کۆتاییەوە

« ێ( ێت )//ا ( ات ) ••• » دەبینرێ ، ئەگەر جێناو بوایە ، دەبوو وەك هەموو ئەوانیتر لە کاتی ڕابوردوودا دەرکەوتایەتەوە •

٢ ـ ئەگەر کردارێکی کاتی ڕانەبوردووی تێپەڕ بێنین گەردانی بکەین :

| | | |
|---|---|---|
| دەفرۆشم | ، | دەخۆم |
| دەفرۆشی(یت) | ، | دەخۆی(یت) |
| دەفرۆشێ(ێت) | ، | دەخوا (ات) |
| دەفرۆشین | ، | دەخۆین |
| دەفرۆشن | ، | دەخۆن |
| دەفرۆشن | ، | دەخۆن |

بە ڕوخسار وا دەردەکەوێ کــە « ێ( ێت )//ا ( ات ) »یش وەك ( م ، ی ، ین ، ن ، ن ) جێناوبێ ، بەڵام لەڕاستیدا وا نییە ، بەڵگەش بۆ ئەوە ، ئەمەیە ئەو جێناوانە لەو ڕێژەیەی ســـەرەوەدا ، کە وەك کـارا ( فاعل ) هاتوون ، ئەگەر بیانخەینە حاڵەتێکی بەرکـار ( مفعول )ی‌یەوە ، دەبینین تەنیا « ێ ( ێت )//آ( ات ) ••• » نامێنێ‌و دەنا ئەوانیتر هەموو دێنەوە • وەك :

| | | |
|---|---|---|
| دەیانفرۆشتم | ، | دەیانخواردم |
| دەیانفرۆشتی(یت) | ، | دەیانخواردی(یت) |
| دەیانفرۆشت | ، | دەیانخوارد |
| دەیانفرۆشتین | ، | دەیانخواردین |
| دەیانفرۆشتن | ، | دەیانخواردن |
| دەیانفرۆشتن | ، | دەیانخواردن |

ئـەگــەر ئــەو « ێ( ێت )//ا ( ات ) »ەی لە کۆتایی کــرداری ڕانەبوردووی کەسی سێیەمی تاکدا جێنـــاو بوایە ، دەبوو ئـەویش وەك ( م ، ی ، ین ، ن ، ن ) دەرکەوتایەو ببوایــە بە بەرکار • جا ئـەمـە نیشانی ئەوە دەدا . کە « ێ(ێت)//ا ( ات ) » زیادەی گەردانەو جێنـــاو نییــە •

٣ ـ بەشێك لە زمانەوانان بۆ پتەوكردنی دانانی ( ێ ) بـە جێناوی كـەسی سێیەمی تـاك هەنـدێ نموونە دەهێننەوە ، كـە ڕەنگە چاوی پێبخەڵەتێ . وەك ئەوەی دەڵێن ، لە وشەكانی ( دامێ ، دامانێ ) ، ( ێ ) جێناوی كەسـی سـێیەمی تاكەو لەگەڵ كرداری ڕابوردوودا هـاتووەو دەوری بەركار دەبینێ ••• هەرچی ( م )و ( مان )یشـــە دەوری كـارا دەگێڕن ••• وا بزانم بە لێكدانەوەیەكی ســــــەرپێیی ، ئەو ڕایــە دەپووچێنەوەو ئاشـــــكرا دەبێ ، كە ئەو ( ێ )یە جێناو نییەو زیـادەی گەردانییە •••

وشـــــەی « دامێ » هەر لەبەرئەوەی واتای « من بە ئەوم دا » دەگەیەنێ . نووسەران وا تێگەیشتوون ئیتر ( ێ ) دەبێ جێنـاوی لكاوی ( ئـەو ) بێ ••• بەڵام من تەنیا ئەوەندە دەڵێم ، ئەگەر ( ێ ) جێنـاوبێ ، ئەی چی لە « دامنێ » بكەین ، كە واتای « من بە ئەوانم دا » دەگەیەنێ • لێرەدا ئاشكرا دیارە كە ( م ) جێناوی كەسی یەكەمی تاكەو كارایــە ••• ( ن )ش جێناوی كەسی سێیەمی كۆیەو بەركارە ••• خۆ ناكرێ بڵێین سێ جێناو پێكەوە دێن • وێڕای ئەوە لەو ڕستەیەدا كەسی سێیەم مەبەســـت نییەو ( ێ )ش نە كارایەو نە بەركارە ••• جا ئەمە كە ئەو دەورانەی جێناوە لكاوەكان دەیانبینن ، نەیانبینێ ، ئیتر چۆن دەبێ بە جێناو •••

٤ ـ لە كرداری تێنەپەڕی ڕابوردووی ئینشـــائیی نزیكدا دەوترێ « چووبێ ( ێت ) ، مردبێ ( ێت ) ، كەوتبێ ( ێت ) ••• » ، بەڵام لەهەمان ڕێژەدا ئەگەر كـردارەكە تێپەڕ بوو دەوترێ : « گـرتبێتی ، فرۆشتبێتی ، ناردبێتی ••• » • گومان لەوەدا نییە ، كە ( ی )ی كۆتایی ئەم كۆمەڵەی دوایی • واتە هی كردارە تێپەڕەكان ـ جێناوی كەسی سێیەمی تاكیكرداری تێپەڕە ••• جا ئەگەر ئەو هەڵەیە بكەین و بڵێین ( ێت ) جێنـــاوە ، ئەوە دەبێ بۆ داپۆشینی ئەو هەڵەیە دەستووری زمانەكەمان تێكدەین و بڵێین ،

وشەکانی « گرتبێتی . فرۆشتبێتی ، ناردبێتی ••• » دوو جێنــاوی کەسی سێیەمی تاکیان تێدایە •••

٥ ــ ئێمە دەزانین ڕێژەی ڕانــەبــوردووی لـــە چاوگی ئەلفی‌یەوە وەرگیراو ، وەك « گەڕان : دەگەڕێم ، دەگەڕێی(یت) ، دەگەڕێ(ێت)••• سووتان : دەسووتێم . دەسووتێی ( یت ) ، دەســـــووتێ ( ێت ) ••• خنـــکان : دەخنکێم . دەخنکێی ( یت ) ، دەخنکێ ( ێت ) ••• برژان : دەبرژێم ، دەبرژێی ( یت ) ، دەبرژێ ( ێت ) ••• » زیادەی « ێ (ێت) »ی گەردانی وەردەگرن . کەچی بەشـــێك لەو چاوگە ئەلفی‌یانە لـــە کـــاتی ڕانەبوردوودا ( ی ) لـەبریتی « ێ ( ێت ) » ••• وەردەگـــــرن ، وەك : « ژیان : دەژیم ، دەژی (یت) ، دەژی ••• گـــریـــان : دەگـــریـم ، دەگری ( یت ) ، دەگری ••• » •

بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ سەرنجی بۆ ڕابکێشین ئەوەیە کـە چ ئەوانەی ( ێ/ێت ) وەردەگرن‌و چ ئەوانەی ( ی ) یان دەچێتەسەر تێکڕا لە کاتی ڕابوردوودا کۆتاییان بە ( ا ) دێت ، وەك :

کۆمەڵی یەکەم ــ گەڕا ، سووتا ، خنکا ، برژا •••
کۆمەڵی دووەم ــ ژیـا ، گریـا •••

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی بزانـرێ ( ێ/ێت ) یـان ( ی ) زیـادەی گەردانین ، نەك جێناوی کەسیی لکاو •

**هەندێ دیاردەی ڕێزمانی :**

١ ــ کاتێك جێناوی لکاوی بەهێزو بێ‌هێز ( واتە ــ دەســـــتەی یەکەم‌و دووەم ) لە کرداری تێپەڕدا پێکەوە دێن ، ئەوە :

أ ــ ئەگەر کردارەکە لـە کاتی ڕابوردوودا بێ ، هەمیشە بەهێزەکـە ( دەستەی یەکەم ) دەبێتە کاراو بێ‌هێزەکە ( دەستەی دووەم )

دەبێتە بەرکار • وەك :
ناردمانن ـ ئێمە ئەوانمان نارد •
گرتیانین ـ ئەوان ئێمەیان گرت •
فرۆشتتانم ـ ئێوە منتان فرۆشت •

ب ـ ئەگەر کردارەکە لە کاتی ڕانەبوردوودا بێ ، بە پێچەوانەوە بەهێزەکە ( دەستەی یەکەم ) دەبێتە بەرکارو بێهێزەکە دەبێتە کارا • وەك :

دەتگرین ـ ئێمە تۆ دەگرن
دەتانگرین ـ ئێمە ئێوە دەگرین
دەماننێرن ـ ئەوان ئێمە دەنێرن
دەمفرۆشن ـ ئەوان من دەفرۆشن

٢ ـ بەڵام کرداری تێنەپەڕ لەبەرئەوەی لە ڕەسەندا کرداری بێبەرکاری ڕاستەوخۆیە ، چ لە کاتی ڕابوردوو و چ لە کاتی ڕانەبوردوودا لەیەك جێناو زیاتر وەرناگرێ‌و ئەویش تەنیا دەوری کارا دەبینێ • وەك :

دەنووم ـ دەنووین ••• نووستم ـ نووستین •••
دەچم ـ دەچین ••• چووم ـ چووین •••

٣ ـ دوو جێناوی دەستەی یەکەم پێکەوە دێن • لەم بارەدا یەکەمیان دەبێتە بەرکارو دووەمیان کارا ، وەك :

ناردمانی
ناردمانت
ناردماتتان
ناردمانیان

٤ ـ بەڵام دوو جێناوی دەستەی دووەم پێکەوە نایەن •

٥ ـ چ دەستەی یەکەمو چ دەستەی دووەم بە تەنیا دێن •

کاتێ بە تەنیا دەردەکەون لە هەر ڕێژەیەکدا بن ، وەك کارا خۆیـــان دەنوێنن ••• دەستەی یەکەم دەچنە ســــــەر ڕابوردووی بێپەڕو دەستەی دووەم بـــە ڕابوردووی تێنەپەڕو ڕانەبوردووی تێپـــەڕو تێنەپەڕەوە دەلکێن •

**وەك :**

أ ـ ڕابوردووی تێپەڕ :

| | | |
|---|---|---|
| خوێندم | ، نووسیم ••• | ( م ) |
| خوێندت | ، نووسیت ••• | ( ت ) |
| خوێندی | ، نووسی ••• | ( ی ) |
| خوێندمان | ، نووسیمان ••• | ( مان ) |
| خوێندتان | ، نووسیتان ••• | ( تان ) |
| خوێندیان | ، نووسیان ••• | ( یان ) |

ب ـ ڕابوردووی تێنەپەڕ :

| | | |
|---|---|---|
| چووم | ، کەوتم ••• | ( م ) |
| چووی(یت) | ، کەوتی( یت ) ••• | ( ی ) |
| چوو | ، کەوت ••• | ( • ) |
| چووین | ، کەوتین ••• | ( ین ) |
| چوون | ، کەوتن ••• | ( ن ) |
| چوون | ، کەوتن ••• | ( ن ) |

ج ـ ڕانەبوردووی تێپەڕ :

| | | |
|---|---|---|
| دەخوێنم | ، دەنووسم ••• | ( م ) |
| دەخوێنی( یت ) | ، دەنووسی( یت ) ••• | ( ی ) |

| | | |
|---|---|---|
| دەخوێنیـ( ێت ) ، | دەنووسیـ( ێت ) . | ( ە ) |
| دەخوێنین ، | دەنووسین ... | ( ین ) |
| دەخوێنن ، | دەنووسن ... | ( ن ) |
| دەخوێنن ، | دەنووسن ... | ( ن ) |

د ـ ڕانەبوردووی تێنەپەڕ :

| | | |
|---|---|---|
| دەچم ، | دەکەوم ... | ( م ) |
| دەچی( یت ) ، | دەکەوی( یت ) ... | ( ی ) |
| دەچیـ( ێت ) ، | دەکەویـ( ێت ) ... | ( ە ) |
| دەچین ، | دەکەوین ... | ( ین ) |
| دەچن ، | دەکەون ... | ( ن ) |
| دەچن ، | دەکەون ... | ( ن ) |

٦ ـ دەســـــتەی یەکەم ئەرکی ســــەرەکی‌یان دەربڕینی خۆیەتی‌یە ... هەرچی دەستەی دووەمە خۆیەتی دەرنابڕن[٣٨] ، [٣٩] .

أ ـ دەستەی یەکەم :

کچەکەم ، کچەکەت ، کچەکەی ...

مـاڵـم ، ماڵت ، ماڵی ...

ب ـ دەستەی دووەم :

.

... هتد .

---

(٣٨) شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەمەد پەنجەی بۆ بەشێکی زۆری ئەو بەڵگانە ڕاکێشـــاوە ( بڕوانە : مەســـعوود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٨٨ ـ ٩١ ) .

(٣٩) شایانی باسە ، مامۆستا محەمەد مەعرووف فەتتاح پەنجەی بۆ ئـەم ڕاستی‌یە ڕاکێشاوە ( بڕوانە : محەمەد مەعرووف فەتتاح ، خۆیەتی لە زاری سلێمانیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەســـــتەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٧٤ ـ ١٧٥ ) .

دەربارەی جێناوی کەسیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا سێ کێشە هەیە :

١ ـ بەشێکی زۆری زانایان ، ئەگەرچی وا ڕادەگەیەنن ، کە دەستەی دووەمی جێناوەکان لەم دیالێکتەشدا وەك دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەردەکەون . بەلاّم بە کۆتایی کرداریان لە قەڵەم دەدەن .

٢ ـ زوربەی توێژەران وایان نیشانداوە ، کە لە کرمانجیی ژووروودا دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە نین‌و هیچ حاڵەتێکی لەو چەشنە نابینرێ ... هەندێکیش ئەوەیان نیشانداوە ، ئەگەر چی لە دیالێکتی ژووروودا دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە بەرچاو ناکەون ، بەلاّم ئەو مەبەستەی جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا دەیگەیەنن‌و ئەو دەورەی دەیبینن لە کرمانجیی ژووروودا لە شێوازێکی ئێجگار تێزیکدا دەردەبڕێن .

٣ ـ نزیکەی هەموان لەو ڕایەدان کە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا تەنیا ( ێ ) جێناوی لکاوە .

* * *

ئەگەرچی دەستەی دووەمی جێناوەکان وەك دەستەی یەکەم چالاك نین ، بەلاّم ئەمانیش هەروەك دەستەی یەکەم دەتوانن ببنە بەشێك لە ڕستەو دەوری کارا یان بەرکار ببینن‌و جگە لەوەی بەکردارەوە دەلکێن ، هەروەها دەچنە سەر گەلێ بەشە ئاخاوتنی تریش‌و ... جا بۆیە ڕاست نییە بە کۆتایی کردار لەقەڵەم بدرێن[٤٠] .

جێناوە لکاوەکانی دەستەی دووەم لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لەم شێوەیەی خوارەوەدا دەبینرێن :

---

(٤٠) دواتر بە نموونەو بەڵگە ئەو ڕاستی‌یە ئیسپات دەکەین .

| ژمـاره | کەس | جێناوی لکاو |
|---|---|---|
| تـاك | یەکەم | م |
| | دووەم | ی |
| | سێیەم | ە ، ە |
| کـۆ | یەکەم | |
| | دووەم | ن |
| | سێیەم | |

نموونـە :

( م ) ـ کەسی یەکەمی تاك ـ « دکم ، بنهێرم »

**ئەز دکم خوەش بنهێرم ل جەمالا وە هەردوو خوشکانە .**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٥ )

( ی ) ـ کەسی دووەمی تاك ـ « دزانی »

**شـێخێم ! تـو دزانی ئەڤ جزیرە**
**تێـکدا کـوبـەرا و کـورد میرە**

( خانی ، ل ١٥٢ )

کەسی سێیەمی تاك :

( ە ) ـ « ڕابوو »

**... پاشێ ئەو ژ جیێ خوە ڕابوو ...**

( کوردۆ ، ل ٣٥ )

( ە ) ـ « هاتە »

**ئێڤارێ ، چاخێ ئەو هاتە مالێ ...**

( کوردۆ ، ل ٤٥ )

( ن ) ـ کەسی یەکەمی کۆ ـ « وساکن ، ئەداکن »

**هەرچی تـو دبێژی ، ئـەم وســاکن**
**هەرچی تـو دخوازی ، ئـەم ئـەداکن**

( خانی ، ل ١٥٨ )

( ن ) ـ کەسی دووەمی کۆ ـ « بگرن »

**گۆ : « هوونێ ژ ســـوباهی هەیانی ئێڤارێ ، ژ ئێڤارێ هەیـانی سبەهێ ل دۆرا قەسرا مەمێ نۆبەتێ بگرن » .**

( مەمێ ئالان ، ل ٤١ ــ ٤٢ )

( ن ) ـ کەسی سێیەمی کۆ ـ « ڕابوون ، دەرکەتن »

**خورتێن کوردان ڕابوون ، ب دەرکەتن ژ ئۆدەو قاوشانە .**

( مەمێ ئالان ، ل ٥٣ )

وێڕای ئەو جێناوانە ، کە فۆرمی ســـــەرەکین بۆ زمانی ئەدەبیو ئاخاوتنی بەشــە دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروو ، لـــە هەندێ بەشـــە دیالێکتدا فۆرمی دی بە چاو دەکەوێ . بەوێنە :

* لە بەشە دیالێکتی بادینانددا بۆ کەسی یەکەمی کۆ جگە لە ( ن ) ، فۆرمی ( ین )یش بەکاردێنرێ(٤١) وەك :

**... وەکی مە بهیستین مە وێ نڤیسین**

( خالید حسـەین ، ل ٣ )

---

(٤١) هەندی لە نووسەران ئەم تایبەتێتی‌یەیان دەســـــتنیشان کردووە ، بەوێنە بڕوانە :

... لێ بلا ئەم ژ بیر نەکەین کو ...

( خالید حسەین ، ل ٣ )

کەسی یەکەمی تاك فۆرمی ( مە )و بۆ کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمی کۆ ( نە )ش بەکاردێنرێ[٤٢] .

* لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی تورکمەنستاندا هەندێ جار بۆ

* هەندێ لە نووسەران وایان دیاری‌کردووە لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی سوریا[٤٣]و ئازربایجاندا[٤٤] ( ی )و لە ناوچەی بادینانی عێراقدا[٤٥] ( یت ) دەبنە جێناوی لکاوی کەسیی سێیەم . بەڵام لەڕاستیدا چ ( ی ) و چ ( یت ) زیادەی گەردانین ، نەك جێناوی لکاو .

---

ا ــ د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی « وڵاتان‌و میللەتانی رۆژهەڵاتی نێزیك‌و ناوەڕاست » ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٤١ .

ب ــ صادق بەهائەدین ئامێدی ، رێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٤٥ .

(٤٢) بڕوانە : د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییێف ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٧٠ ــ ١٧١ .

(٤٣) بڕوانە : جگر خوێن ، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٧٥ .

(٤٤) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، د. چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٧٠ ــ ١٧١ .

(٤٥) بڕوانە :

ا ــ سەرچاوەی ناوبراو ، د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، ل ٣٤١ .

ب ــ سەرچاوەی ناوبراو ، صادق بەهائەدین ئامێدی ، رێزمانا کرمانجی ، ل ٤٥ .

٢ ـ ڕابوردووی ئیخباریی بەردەوام :

دەدرواین ، دەکێڵراین ، دەنووسراین ... ( ین )

٣ ـ ڕابوردووی ئیخباریی تەواو :

درواوین ، کێڵراوین ، نووسراوین ... ( ین )

٤ ـ ڕابوردووی ئیخباریی دوور :

دروابووین ، کێڵرابووین ، نووسرابووین ... ( ین )

دووەم ـ ڕابوردووی ئینشائی

١ ـ ڕابوردووی ئینشائیی نزیك :

دروابایین ، کێڵرابایین ، نووسرابایین ... ( ین )

٢ ـ ڕابوردووی ئینشائیی بەردەوام :

بدروابایینایە ، بکێڵرابایینایە ، بنووسرابایینایە ... ( ین )

( بدرواینایە ، بکێڵرایینایە ، بنووسرایینایە ... ) ( ین )

٣ ـ ڕابوردووی ئینشائیی تەواو :

دروابین ، کێڵرابین ، نووسرابین ... ( ین )

( دروابێتین ، کێڵرابێتین ، نووسرابێتین ... ) ( ین )

٤ ـ ڕابوردووی ئیخباریی بەردەوام :

دروابووینایە ، کێڵرابووینایە ، نووسرابووینایە ... ( ین )

(دروابووبایینایە ، کێڵرابووبایینایە ، نووسرابووبایینایە...) ( ین )

ج ـ فەرمـــان :

١ ـ فەرمان بە واتاو مەبەستی ئیزنخواستن :

بدروێین ، بکێڵرێین ، بنووسرێین ... ( ین )

٢ ـ فەرمان لە باری نەهی ناصەریحدا :

نەدروێین ، نەکێڵرێین ، نەنووسرێین ... ( ین )

تێبینی :

١ - کرداری کارا بزر هەمیشە لە کرداری تێپەڕ دروست دەکرێ •

٢ - لە کرداری کارا بزرا کارا دەرناکەوێو تەواوکەرەکەی ( بەرکار ) جێی دەگرێو دەوری جێگری کارا دەبینێ •

٣ - لەبەر ئەوەی ئەو کردارە تێپەڕانە دەبنە تێنەپەڕ ، بۆیە جێناوی لکاوی دەستەی دووەمیان بۆ بەکاردێ - واتە گەردانیان لە ڕانەبوردوو و هەموو جۆرەکانی ڕابوردوو و لە حاڵەتی فەرماندا وەك کرداری تێنەپەڕ جێناو وەردەگرن •

* * *

دوای ئەوەی لە زوربەی ئەو حاڵەتانە دواین ، کە یەك جێناوی لکاو بە دەوری کارا لەگەڵ کرداردا دێت ، ئینجا با بە کورتی سەیرێکی حاڵەتەکانی دەرکەوتنی دوو جێناوی لکاو بکەین ، کە یەکێکیان دەبێتە نیشانەی کاراو ئەوی تریان نیشانەی بەرکار •

بەر لەوەی بچینە نێو ئەم باسەوە ، سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین ، ئەو کردارانەی بە نموونە دەیانهێنینەوە سەرپاکیان تێپەڕن ، چونکە وەك ئاشکرایە کرداری تێنەپەڕ بەرکاری ناوێت •

## — ١ —

## لکانیان بە کرداری سادەوە

أ - کاتی ڕانەبوردوو :

جگە لەو حاڵەتەی کە یەك جێناوی دەستەی دووەم وەردەگرێو دەوری کارا دەبینێ ، هەروەها حاڵەتی ئەوتۆش هەیە ، کە دوو جێناو

وەردەگرێ ، کە یەکێکیان لە دەستەی یەکەمەو ئەوی‌تریان لە دەستەی دووەمە • وەك :

دەیان نێرین ـ ئێمە ئەوان دەنێرین
دەتان نێرن ـ ئەوان ئێوە دەنێرن
دەمان نێرن ـ ئەوان ئێمە دەنێرن

لەم حاڵەتەدا دوو تایبەتێتی بەرچاو دەکەوێ :

١ ـ جێناوەکەی دەستەی دووەم دیسان هەر دەوری کارا دەبینێو ئەوی دەستەی یەکەم دەوری بەرکار دەگێڕێ •

٢ ـ جێناوەکەی دەستەی یەکەم هەمیشە پێش ئەوی دەستەی دووەم دەکەوێ ـ واتە ئەوی دەستەی یەکەم لە سەرەتاوە دێو هی دەستەی دووەم لە کۆتاییەوە •

ب ـ کاتی ڕابوردوو :

وێڕای ئەو حاڵەتانەی کە یەك جێناوی دەستەی یەکەم وەردەگرێو دەوری کارا دەبینێ ، چەند حاڵەتێکی تریش دەبینرێ :

١ ـ هاتنی دوو جێناوی دەستەی یەکەم بەسەریەکەوە • وەك :

ڕابوردووی نزیك :

ناردمانیان ـ ئەوان ئێمەیان نارد
• • • • • • • • •
ناردبامانیان ـ ئەوان ئێمەیان ناردبا

ڕابوردووی تەواو :

ناردوومانیان ـ ئەوان ئێمەیان ناردووە
• • • • • • • • •

ناردبسانیان ـ ئەوان ئێمەیان ناردبا

• • • • • • • •

ڕابوردووی دوور :

ناردبوومانیان ـ ئەوان ئێمەیان ناردبوو

• • • • • • • •

ناردبوومانیانایە ـ ئەوان ئێمەیان ناردبووایە

لەم حاڵەتەدا جێناوی یەکەم هەمیشـــە بەرکارەو جێناوی دووەمیش هەردەم کارایە •

٢ ـ هاتنی جێناوێکی دەستەی یەکەم لەگەڵ جێناوێکی دەســـتەی دووەم •

لەم حاڵەتەدا جێناوەکەی دەستەی یەکەم چ لە پێش ئەوەی دەستەی دووەمەوە بێتو چ لـــە پشـــتیەوە ، هـــەر وەك کارا خۆی دەنوێنێ • جێناوەکەی دەستەی دووەمیش چ لە پێش ئەوی دەســـــــتەی یەکەمەوە دەرکەوێو چ لە پشتیەوە ، هەروەك بەرکار دەور دەبینێ • بەنموونە :

أ ـ کاتێ جێناوی دەستەی یەکەم لە پێشەوە دێو ئەوی دەســتەی دووەم بە دوایدا •

ڕابوردووی نزیك :

ناردتانین ـ ئێوە ئێمەتان نارد

ناردیانین ـ ئەوان ئێوەیان نارد

ناردمانن ـ ئێمە ئێوە ( ئەوان )مان نارد •

• • • • • • • •

ڕابوردووی تەواو :

ناردووتانینە ـ ئێوە ئێمەتان ناردووە •

ناردوویانه ـ ئەوان ئێوەیان ناردووە
ناردوومانه ـ ئێمە ئێوە ( ئەوان )مان ناردووە •
• • • • • • • •

ڕابوردووی دوور :

ناردبووتانین ـ ئێوە ئێمەتان ناردبوو
ناردبوویانن ـ ئەوان ئێوەیان ناردبوو
ناردبوومانن ـ ئێمە ئێوە ( ئەوان )مان ناردبوو
• • • • • • • •

ب ـ دەمێ جێناوی دەستەی دووەم لە پێشەوە دەردەکەوێ و جێناوی دەستەی یەکەم بە دوایدا دێ :

ڕابوردووی نزیك :

ناردینیان ـ ئەوان ئێمەیان نارد
ناردنیان ـ ئەوان ئێوەیان نارد
ناردینت ـ تـۆ ئێمەت نارد
• • • • • • • •

ڕابوردووی تەواو :

ناردووینیانە ـ ئەوان ئێمەیان ناردووە
ناردوونیانە ـ ئەوان ئێوەیان ناردووە
ناردووینت ـ تـۆ ئێمەت ناردووە
• • • • • • • •

ڕابوردووی دوور :

ناردبووینیان ـ ئەوان ئێمەیان ناردبوو
ناردبوونیان ـ ئەوان ئێوەیان ناردبوو
ناردبووینت ـ تۆ ئێمەت ناردبوو
. . . . . . . .

هەموو ئەوەی تا ئێرە دەربارەی هاتنی دوو جێناوی لکاو لەگەڵ کرداری ڕابوردوودا وتوومانە بۆ جۆرەکانی ڕابوردووی نزیكو تەواو و دوور دەگونجێ ، بەڵام هەرچی ڕابوردووی بەردەوامە جێناوە لکاوەکان بە جۆرێکی تر لەگەڵی دەردەکەون ، ئەویش تەنیا یەك حاڵەتە کە بریتی‌یە لە هاتنی جێناوێکی دەستەی یەکەم لە سەرەتاوە لە دەوری کاراداو لە کۆتاییەوە جێناوێکی دەستەی دووەم لە دەوری بەرکاردا . بەوێنە :

دەمان ناردن ـ ئێمە ئەوانمان دەنارد
دەیان ناردین ـ ئەوان ئێمەیان دەنارد
دەتان ناردین ـ ئێوە ئێمەتان دەنارد
. . . . . . . .
بمان ناردبنایە ـ ئێمە ئەوانمان بناردبایە
بیان ناردبینایە ـ ئەوان ئێمەیان بناردبایە
بتان ناردبینایە ـ ئێوە ئێمەتان بناردایە
. . . . . . . .

جـ ـ فەرمان :

هەموو جۆرەکانی فەرمان بە تەواوی وەك ڕێژەی کاتی ڕانەبوردوو جێناو وەردەگرنو هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە . واتە لە سەرەتاوە جێناوی دەستەی یەکەم دێو دەوری بەرکار دەبینێو لە کۆتاییشەوە

جێنـــاوی دەستەی دووەم دەردەکـــەوێو وەك کـارا خۆی دەنوێنێ •
بـە وێنـە :

١ ـ فەرمان لە باری ئاساییدا :

بمان نێرن ـ ئێوە ئێمە بنێرن
بیان نێرن ـ ئێوە ئەوان بنێرن

٢ ـ فەرمان بە واتاو مەبەستی ئیزنخواستن :

بیان نێرین ـ ئێمە ئەوان بنێرین
بتان نێرین ـ ئێمە ئێوە بنێرین

٣ ـ فەرمان لە باری نەهی صەریحدا :

مەمان نێرن ـ ئێوە ئێمە مەنێرن
مەیان نێرن ـ ئێوە ئەوان مەنێرن

٤ ـ فەرمان لە باری نەهی ناصەریحدا :

نەیان نێرین ـ ئێمە ئەوان نەنێرین
نەمان نێرن ـ ئێوە ئێمە نەنێرن

— ٢ —

**لکانیان بە کرداری ناسادەوە**

یەکەم ـ کرداری دارێژراو :

أ ـ بە هاریکاری پێشگر سازبوو :

لە کرداری دارێژراوی بە یاریدەی یەك پێشگری سادە سازبوو یان کرداری دارێژراوی بە یاریدەی دوو پێشگری سادە پێکهاتوو یان کرداری دارێژراوی بە یاریدەی پێشگرێکی ناسادە ڕۆنراودا جێناوە لکاوەکان وەك یەك خۆیان دەنوێنن ، بەم چەشنەی خوارەوە :

جێناوه لکاوەکان لــه کاتی ڕانەبوردوو و له حاڵەته هەمەجۆرەکانی فەرمانی کرداری سادەدا چۆنو بــه چ شێوەیەك دەردەکــەونو خۆیان دەنوێنن ، هەر بەو جۆرەش له کرداری به هاریکاری پێشگر داڕێژراودا دێن ـ واته جێناوێکی دەستەی یەکەم له سەرەتاوه دێو دەوری بەرکــار دەبینێ ، لــه کۆتاییشەوه جێناوێکی دەســتەی دووەم دەردەکەوێو دەبێته کارا • به وێنه :

أ ـ کاتی ڕانەبوردوو :

داتان دەگرین ـ ئێمه ئەوان دادەگرین
داتان دەگرن ـ ئەوان ئێمه دادەگرن
• • • • • •
هەڵیان دادەتەکێنین ـ ئێمه ئەوان دادەتەکێنین
هەڵمان دادەتەکێنن ـ ئەوان ئێمه هەڵدادەتەکێنن
• • • • • •
ڕێکیان دەخەین ـ ئێمه ئەوان ڕێكدەخەین
ڕێکمان دەخــەن ـ ئەوان ئێمه ڕێكدەخەن
• • • • • •

ب ـ فەرمــان :

١ ـ لــه بــاری ئاســاییدا :

دامــانبگــرن ـ ئێوه ئێمه دابگرن
هەڵمانداتەکێنن ـ ئێوه ئێمه هەڵداتەکێنن
ڕێکمانبخەن ـ ئێوه ئێمه ڕێكبخەن
• • • • • •

٢ ـ فەرمان بە واتاو مەبەستی ئیزنخواستن :

دایـانبگـرین ـ ئێمە ئەوان دابگرین
هەڵیاندابتەکێنین ـ ئێمە ئەوان هەڵدابتەکێنین
ڕێکیانبخەین ـ ئێمە ئەوان ڕێكبخەین

٣ ـ فەرمان لە باری نەهی صەریحدا :

دامانمەگرن ـ ئێوە ئێمە دامەگرن
هەڵماندامەتەکێنن ـ ئێوە ئێمە هەڵدامەتەکێنن
ڕێکمانمەخەن ـ ئێوە ئێمە ڕێكمەخەن

٤ ـ فەرمان لە باری نەهی ناصەریحدا :

دایـاننەگـرین ـ ئێمە ئەوان دانەگرین
هەڵیاندانەتەکێنین ـ ئێمە ئەوان هەڵدانەتەکێنین
ڕێکیاننەخەین ـ ئێمە ئەوان ڕێكنەخەین

• • • • • •

وەك نیشانماندا ، جێناوە لکاوەکـان لە کاتی ڕابوردووی نزیـكو تەواو و دووری کرداری سادەدا یەك دەسـتوور پەیڕەوی دەکەنو ڕابوردووی بەردەوامیش دەستووری جیاوازی تایبەتیی خۆی هەیە ••• هەرچی کرداری داڕێژراوی بە هاریکاریی پێشگر سـازبووە تێکڕای جۆرەکانی ڕابوردووی وەك ڕابوردووی بەردەوامی کرداری سـادە جێناوی لکاو وەردەگرێ ، ئەویش کـە بریتییە لـە هـاتنی جێناوێکی دەستەی یەکەم لە سەرەتاوە لە دەوری کاراداو لـە کۆتاییەوە جێناوێکی دەستەی دووەم لە دەوری بەرکاردا ، وەك :

ڕابوردووی نزیك :

دامانگرتن ، دایانگرتین ، داتانگرتین •

هەلْمانداتەكاندن ، هەلْیانداتەكاندین ، هەلْتانداتەكاندین •
ڕێكمانخستن ، ڕێكیانخستین ، ڕێكتانخستین •
ڕابوردووی بەردەوام :
دامانده‌گرن ، دایانده‌گرتن ، داتانده‌گرتین •
هەلْمانداتەكاندن ، هەلْیاندادەتەكاندین ، هەلْتاندادەتەكاندین •
ڕێكماندەخستن ، ڕێكیاندەخستین ، ڕێكتاندەخستین •
ڕابوردووی تەواو :
دامانگرتوون ، دایانگرتوون ، داتانگرتوون •
هەلْمانداتەكاندوون ، هەلْیانداتەكاندووین ، هەلْتانداتەكاندووین •
ڕێكمانخستوون ، ڕێكیانخستوون ، ڕێكتانخستوون •
ڕابووردووی دوور :
دامانگرتبوون ، دایانگرتبوون ، داتانگرتبوون •
هەلْمانداتەكاندبوون ، هەلْیانداتەكاندبووین ، هەلْتانداتەكاندبووین •
ڕێكمانخستبوون ، ڕێكیانخستبوون ، ڕێكتانخستبوون •
• • • • • •

ب ـ بە هاریكاریی پاشگر سازبوو :

هەرچی كرداری داڕێژراوی بە یاریدەی پاشگری ( ەوە / وە )و ( اندن )یشە لە هەموو ڕێژەیەكدا وەك كرداری سادە جێناوی لكاو وەردەگرێ • واتە :

١ ـ لە كاتی ڕانەبوردوو و هەموو حاڵەتەكانی فەرماندا لە سەرەتاوە جێناوی دەستەی یەكەم دێ‌و دەوری بەركار دەبینێ‌و لە كۆتاییشەوە جێناوی دەستەی دووەم دەردەكەوێ‌و وەك كارا خۆی دەنوێنێ •
بە وێنە :

کاتی ڕانەبوردوو :

دەیانئێرینەوە ـ ئێمە ئەوان دەئێرینەوە •

دەمانسووتێنن ـ ئەوان ئێمە دەسووتێنن •

فەرمان :

بمانئێرنەوە ـ ئێوە ئێمە بنێرنەوە •

بمانسووتێنن ـ ئێوە ئێمە بسووتێنن •

• • • • • •

بیانئێرینەوە ـ ئێمە ئەوان بنێرینەوە •

بتانسووتێنین ـ ئێمە ئێوە بسووتێنین •

• • • • • •

مەمانئێرنەوە ـ ئێوە ئێمە مەنێرنەوە •

مەیانسووتێنن ـ ئێوە ئەوان مەسووتێنن •

• • • • • •

نەیانئێرینەوە ـ ئێمە ئەوان نەئێرینەوە •

نەمانسووتێنن ـ ئێوە ئێمە نەسووتێنن •

• • • • • •

٢ ـ لە ڕێژەی ڕابوردووی نزیكو تەواو و دووردا سێ حاڵەت پەیدا دەبێ :

یەك ـ هاتنی دوو جێناوی دەستەی یەكەم بەسەریەكەوە • لەم حاڵەتەدا جێناوی یەكەم هەمیشە بەرکارەو جێناوی دووەمیش هەردەم کارایە • وەك :

ناردمانیانەوە ـ ئەوان ئێمەیان ناردەوە •

سووتاندمانیان ـ ئەوان ئێمەیان سووتاند •

• • • • • •

ناردوومانیانەوە ـ ئەوان ئێمەیان ناردووەتەوە •

سووتاندوومانیان ـ ئەوان ئێمەیان سووتاندووە •

• • • • • •

ناردبوومانیانەوە ـ ئەوان ئێمەیان ناردبووەوە •

سووتاندبوومانیان ـ ئەوان ئێمەیان سووتاندبوو •

• • • • • •

دوو ـ هاتنی جێناوێکی دەستەی یەکەمو بەدوایدا جێناوێکی دەستەی دووەم • لەم بارەدا جێناوەکەی دەستەی یەکەم دەبێتە کاراو ئەوەی دەستەی دووەم بەرکار • وەك :

ناردتانینەوە ـ ئێوە ئێمەتان ناردەوە •

سووتاندمانن ـ ئێمە ئەوانمان سووتاند •

• • • • • •

ناردووتانینەوە ـ ئێوە ئێمەتان ناردووەتەوە •

سووتاندوومانن ـ ئێمە ئەوانمان سووتاندووە •

• • • • • •

ناردبووتانینەوە ـ ئێوە ئێمەتان ناردبووەوە •

سووتاندبوومانن ـ ئێمە ئەوانمان سووتاندبوو •

• • • • • •

سێ ـ دەرکەوتنی جێناوێکی دەستەی دووەمو بە دوایدا جێناوێکی دەستەی یەکەم • لەم حاڵەتەدا جێناوەکەی دەستەی دووەم بەرکارەو ئەوی دەستەی یەکەم کارایە • وەك :

ناردینیانەوە ـ ئەوان ئێمەیان ناردەوە •

سووتاندینیان ـ ئەوان ئێمەیان سووتاند •

• • • • • •

ناردووینیانەوە ـ ئەوان ئێمەیان ناردووەتەوە •
سووتاندووینیان ـ ئەوان ئێمەیان سووتاندووە •
• • • • • •
ناردبووینیانەوە ـ ئەوان ئێمەیان ناردبووەوە •
سووتاندبووینیان ـ ئەوان ئێمەیان سووتاندبوو •
• • • • • •

٣ ـ لە ڕێژەی ڕابووردووی بەردەوامدا تەنیا یەك حاڵەت هەیە ، ئەویش بریتی‌یە لە هاتنی جێناوێكی دەستەی یەكەم لە سەرەتاوە لە دەوری كاراداو لە كۆتاییەوە جێناوێكی دەستەی دووەم لە دەوری بەركاردا • بە وێنە :

دەمانناردنەوە ـ ئێمە ئەوانمان دەناردەوە •
دەمانسووتاندن ـ ئێمە ئەوانمان دەسووتاند •

دووەم ـ كرداری لێكدراو :

كرداری لێكدراویش حاڵەتی ڕانەبوردوو و فەرمانی لەگەڵ كرداری سادەو داڕێژراودا هیچ جیاوازییەكی نییە • هەرچی حاڵەتی ڕابوردوویشی‌یەتی لە لایەكەوە لە كرداری داڕێژراو نزیك دەبێتەوەو لە لایەكی‌ترەوە لە كرداری سادە • ئەمیش وەك كرداری داڕێژراو هەر چوار ڕێژەی نزیكو بەردەوامو تەواو و دووری بەیەك چەشنن جێناو وەردەگرێ • بەڵام لە ڕووی جۆرو دەوری جێناوەكانەوە لە كرداری سادە نزیك دەبێتەوەو لەگەڵ خاڵی یەكەمو بەشی ئەلفی خاڵی دووەمی‌دا بە تەواوی یەكدەگرنەوە • تەنیا جیاوازی لە نێوانیاندا ئەوەیە ، كە كرداری لێكدراو حاڵەتی بەشی ( ب )ی خاڵی دووەم كرداری سادەی نییە • واتە :

١ ـ لە کاتی ڕانەبوردوو و هەموو جۆرەکانی فەرماندا لـە پێشەوە جێناوی دەستەی یەکـــەم دەردەکـەوێو دەوری بەرکار دەگێڕێو لـــە کۆتاییشەوە جێناوی دەســــــتەی دووەم دێو وەك کارا خۆی دەنوێنێ •
بە نموونە :

کاتی ڕانەبوردوو :

سەرمانبشـکێنن ـ ئێوە سەری ئێمە بشـکێنن •
ڕێگاماندەگرن ـ ئەوان ڕێـگای ئێمە دەگرن •

فەرمـــان :

سەرمانبشـکێنن ـ ئێوە سەری ئێمە بشـکێنن •
ڕێگامانبگـرن ـ ئێوە ڕێگای ئێمە بگرن •
• • • • • •
سەریانبشـکێنین ـ ئێمە سەری ئەوان بشکێنین •
ڕێگاتانبگـرین ـ ئێمە ڕێگای ئێوە بگرین •
• • • • • •
سەرمانمەشـکێنن ـ ئێوە سەری ئێمە مەشکێنن •
ڕێگایـانمەگرن ـ ئێوە ڕێـگای ئەوان مەگرن •
• • • • • •
سەریاننەشـکێنن ـ ئێوە سەری ئەوان نەشـکێنن •
ڕێگاماننەگـرن ـ ئێوە ڕێـگای ئێمە مەگرن •
• • • • • •

٢ ـ لە هەموو ڕێژەکانی ڕابوردوودا دوو حاڵەت بەدی دەکرێ :
یەك ـ هاتنی دوو جێناوی دەستەی یەکەم بەســــــەر یەکـەوە •
لەم حاڵەتەدا جێناوی یەکەم هەمیشە بەرکارەو جێناوی دووەمیش هەردەم کارایە • یەك :

سەرمانیانشکاند ـ ئەوان سەری ئێمەیان شکاند •
ڕێگایانمانگرت ـ ئێمە ڕێگای ئەوانمان گرت •
• • • • • •
سەرمانیاندەشکاند ـ ئەوان سەری ئێمەیان دەشکاند •
ڕێگایانماندەگرت ـ ئێمە ڕێگای ئەوانمان دەگرت •
• • • • • •
سەرمانیانشکاندووە ـ ئەوان سەری ئێمەیان شکاندووە •
ڕێگایانمانگرتووە ـ ئێمە ڕێگای ئەوانمان گرتووە •
• • • • • •
سەرمانیانشکاندبوو ـ ئەوان سەری ئێمەیان شکاندبوو •
ڕێگایانمانگرتبوو ـ ئێمە ڕێگای ئەوانمان گرتبوو •
• • • • • •

دوو ـ هاتنی جێناوێکی دەستەی یەکەم لە ناوەڕاستداو جێناوێکی دەستەی دووەم لە کۆتاییەوە • لەم بارەدا جێناوەکەی دەستەی یەکەم ـ واتە ئەوەی لە ناوەڕاستدا دێ ـ دەبێتە کاراو ئەوی دەستەی دووەم ، کە لە کۆتاییەوە دەردەکەوێ دەبێتە بەرکار •

وەك :

سەرتانشکاندین ـ ئێوە سەری ئێمەتان شکاند •
ڕێگامانگرتن ـ ئێمە ڕێگای ئێوە ( ئەوان )مان گرت •
• • • • • •
سەرتاندەشکاندین ـ ئێوە سەری ئێمەتان دەشکاند •
ڕێگاماندەگرتن ـ ئێمە ڕێگای ئێوە ( ئەوان )مان دەگرت •
• • • • • •
سەرتانشکاندووین ـ ئێوە سەری ئێمەتان شکاندووە •

ڕێگامان گرتوون ـ ئێمە ڕێگای ئێوە ( ئەوان )مان گرتووە •
• • • • • •

سەرتان شکاندبووین ـ ئێوە سەری ئێمەتان شکاندبوو •
ڕێگامان گرتبوون ـ ئێمە ڕێگای ئێوە ( ئەوان )مان گرتبوو •

*   *   *

## جێناوی خـۆیی

وێنەی جێناوی خۆیی لە ئاوێستادا لە شێوەی ( هڤە ، خوە ، خوەتۆ )دا دەبینرێ[٨٠]و لە فارسیی ناوەڕاستدا لە فۆرمی ( خوەت )دا بەرچاودەکەوێ[٨١]و لە فارسیی نوێدا بووە بە ( خود )[٨٢] •••

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا ئەگەرچی ( خۆ ) فۆرمی سەرەکیی جێناوی خۆیی یە . بەڵام لە هەندێ حاڵەت و لە هەندێ بەشە دیالێکتدا شێوەی ( خود )[٨٣]یش هەیە •

---

(٨٠) بڕوانە : س. ن. سۆکۆلۆڤ ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٦٤ .

(٨١) بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٦٨ .

(٨٢) بڕوانە :

أ ـ ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٢٨ ـ ٢٩ .

ب ـ علی برناك ، دستور زبان فارسی ، ١٣٤٧ ، ل ٢٨ .

(٨٣) دواتر لێی دەدوێین •

له دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لەگەڵ ئەوەشدا کە ( خوە ) فۆرمی سەرەکی‌یە . بەڵام شێوەی ( خۆ )[84] و ( خوو )[85] و ( خۆن )[86] و ( خوا )[87]یش دەبینرێن .

ئەگەر ئاورێك لەو کتێبانە بدەینەوە کە لە ڕێزمانی کوردی دەدوێن‌و سەرنج لەو شوێنانەیان ڕابگرین کە دەربارەی ( جێناوی خۆیی ) لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودان ، وێڕای بینینی هەڵەو ناتەواوی‌و بە لای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوون‌و سادەیی ، ئەوە بەدی دەکەین کە نووسەران لەم باسەدا دەبنە دوو کۆمەڵ :

---

(٨٤) بەوێنە بڕوانە :

أ ـ چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٣ .

ب ـ ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١١٤ .

ج ـ م. خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی « وڵاتان‌و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نیزیك‌و ناوەڕاست » ، ب ٧ . یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٢٤ .

(٨٥) بەوێنە بڕوانە :

أ ـ سەرچاوەی ناوبراو ، چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٦٢ .

ب ـ سەرچاوەی ناوبراو ، م. خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، ل ٣٢٤ .

(٨٦) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٦٣ .

(٨٧) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ... ، ل ١١٤ .

کۆمەڵی یەکەم وا ڕادەگەیەنن کە مۆرفیمی ( خۆ ) جێناوی خۆیییەو دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکان ( م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان ) وەردەگریو دەبێتە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان )[88] ...

کۆمەڵی دووەم وایان داناوە ، کە ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) جێناوی خۆیین[89] .

ئەگەرچی کۆمەڵی یەکەم ڕاست بۆ دیاریکردنی فۆرمی ئەو جێناوە چوون ، بەڵام ناتەواوییان ئەوەیە ، کە تەنیا حاڵەتی پێوەلکاندنی جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەمیان باسکردووەو بە هیچ چەشنێك ئەوەیان یادداشت نەکردووە کە جێناوی ( خۆ ) جێناوێکی لکاوی دەستەی دووەم یان دوو جێناوی لکاوی دەستەی یەکەم پێکەوە یان جێناوێکی لکاوی

---

(٨٨) بەنموونە ، وەك :

أ ـ ك. ڕ. ئەیووبیو ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٥٢ .

ب ـ سەرچاوەی ناوبراو ، چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٦٣ .

ج ـ ق. کوردۆییێف ، دەستووری زمانی کوردی ... ، ل ١١٤ .

د ـ ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢٨ .

هـ ـ سەرچاوەی ناوبراو ، م. خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، ل ٣٣٤ .
...و هەندێکیتر .

(٨٩) بە نموونە ، وەك :

أ ـ تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ١١٢ ـ ١١٣ .

دەستەی یەکەم‌و بە دوایدا جێناوێکی دەســتەی دووەم یان ( ش/یش )ی پێوەندی‌و بە دوایدا جێناوێکی دەستەی یەکەم ••• یش وەردەگرێ ••• یاخود دەبێتە پارچەیەکی وشەی داڕێژراو یان لێکدراو •••

کۆمەڵی دووەم لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ شتێکی ئەوتۆیان لەبارەی ئەو جێناوەوە تۆمارنەکردووە ، هەروەها لە دیاری‌کردنی فۆرمیشـــــیدا بە هەڵەچوون • ئەگەر جێناوی خۆیی ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) بوایە ، ئەوە لە شێوەی ( خۆ )دا دەرنەدەکەوت یاخود ( ش/یش )ی پێوەندی نەدەکەوتە نێوان ( خۆ )و جێناوە لکاوەکانەوە ، یاخود نەدەبوو ( خۆ ) ببێتە پارچەیەکی وشەی ناســادە ، بەڵکو دەبوو ( خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ) بێن •••

جێناوی ( خۆ )[٩٠] ، کە واتای خۆیەتی‌و خاوەنێتی دەگەیەنێ ، لـە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا بەم جۆرانەی خوارەوە دەردەکەوێ :

---

ب ــ نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، ســـلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٩٥ ــ ٩٦ •

ج ــ عەبدوڵلا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەســـووڵ ، د. ئەمین عەلی • نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین ســـەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مســـتەفا ســـەندی ، زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢١ ــ ٢٢ •

د ــ د. کوردستان موکریانی ، جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕستەی کوردیدا لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و کرمانجیی ژووروودا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەســتەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٤٩ ــ ٢٥٠ •

...و هەندێکی‌تر •

(٩٠) ( خۆ )ی جێناو کە لە ڕووی واتاوە بەرانبەر ( نفس ، عین ــ Self ) دەوەســـــتێ‌و هەندێ جاریش جێگای تەئکید دەگرێتەوە ؛ لەگــەڵ

١ ـ بێ ئەوەی هیچ زیادی‌یەکی لەگەڵ بێ ، وەك :

**خۆ لە خۆ[٩١] ئەکوتێ ، بێگانە لە کولۆری دارا**

( پەندی پێشینان ، ل ١٩٦ )

**هــەروا دەڕوا خــۆ دەشـــــلینی**
**پــەنجــەو پــانیــان لـۆ یــەك دینی**
**قەســـدێ دەکـا بمســـــووتینی**

( فۆلکلۆر )

٢ ـ یەك جێناوی دەستەی یەکەم وردەگرێ ، وەك :

خۆ + م ⟵ خۆم

**لە ژینی خۆم ئومێدم قەطعە (( نالی )) !**
**کــە ســووتاوە هەموو جەرگ‌و هەناوم**

( نالی ، ل ٢٩٤ )

خۆ + ت ⟵ خۆت

**خوت ســووکەکە بــە غائیلەی ســەد مەرامەوە**
**تــا مــاوی ڕابــوێــرە بــە نــامووس‌و نــامــەوە**

( زێــوەر ، ل ٢٠ )

---

ئامرازی ( خۆ ، کە بە واتای ( إذا ، لو ) دێ‌و لەگەڵ مۆرفێمی ( خۆ ) کە ڕەگی کرداری ڕانەبوردووی ( خواردن )ە ... نابێ تێکەڵبکرێ .

ئامرازی ( خۆ . وەك :

**خۆ مریشك نیم بــە دەندووك شەڕبکەم**

( پەندی پێشینان ، ل ١٩٧ )

( خۆ )ی ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو :

**شـــــەربەتی خەوفو ڕەجـای ئەغیـار ویـار**
**ترش‌و شـــــیرین هــەم دەچێژم ، هەم دەخۆم**

( نالی ، ل ٢٩٧ )

... هتد .

(٩١) ئەو ( خۆ )یە بە واتای ( خزم ) دێت .

خۆ + ی ⟵ خۆی

**خـۆی خســـتۆتـه ســـاجی عەلی**

( پەندی پێشینان ، ل ١٩٨ )

خۆ + مان ⟵ خۆمان

**ئـەی بلبـل ، هـــەژار خۆمـــان**
**بێدەســـــتەڵات ، پڕ گومـــان ،**

( گۆران ، ل ١٠٨ )

خۆ + تان ⟵ خۆتان(٩٢)

**دوژمن بــە خۆتــان خۆش مەکـەن**
**هەموو بــە جـارێ لــە چەپلەدەن**

( بێ‌کەس ، ل ٨١ )

خۆ + یان ⟵ خۆیان(٩٣)

**پۆل پۆل ئەهاتنە سەر ڕێگەمانو قەدرێك شــەڕەتفەنگ ئەکراو زەفەریان نەئەبرد ، خۆیان ونئەکرد .**

( لە خەوما ، ل ٣٠ )

---

(٩٢) لە هەندێ شێوەی کوردیدا لە جێگای ( خۆمـان ) شێوەی ( خۆن )و لەبریتی ( خۆتان ) فۆرمی ( خۆو ) بەکاردێ . ( بڕوانە : مەســعوود محەمەد ، ســـــووڕێکی خامە بە دەوری ڕاناودا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٧٨ ) .

(٩٣) هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ئەو حاڵەتانەی جێناوی ( خۆ ) کە جێناوی لکاو وەردەگرن ، بە ( جێناوی خۆیی کەسی ) ناودەبەن . بەوێنە ، بڕوانە ( ڕ. ل. تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردیەوە ، مۆســـــکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢٨ ؛ ك. ڕ. ئەیووبی‌و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٥٢ ...و هەندێکی‌تر ) .

٣ ـ جێناوێکی دەستەی دووەمی دەچێتە سەر ، وەك :

خۆ + م ← خۆم

**من خـۆم ، نەناسـیاو نیم .**

خۆ + ی( یت ) ← خۆی( یت )

**تـۆ خۆی(یت) ، نەناسـیاو نیت .**

خۆ + ە ← خۆیە

**ئـەو خۆیە(٩٤) ، نەناسـیاو نیە .**

خۆیە + ین ← خۆین

**ئێمە خۆین ، نەناسـیاو نین .**

خۆ + ن ← خۆن

**ئێوە خۆن ، نەناسـیاو نین .**

خۆ + ن ← خۆن

**ئەوان خۆن ، نەناسـیاو نین .**

---

**ئەگەرچی ڕاستە جێنـاوی خۆیی بەبێ جێناوی لکاو کـەسی قسەکەر** یان **قسەبۆکراو** یان **قسەلێکراوی تێـدا نییە ، بەڵام ئەمـە وا ناگـەیـەنێ کە جێناوی لکاو وەربگرێ ببێتـە جێنـاوێکی تر ... چونکە ئەگەر بەو پێیە بێ ، ئەوە دەبێ کاتێ جێناوی لکاو دەچێتە سەر ناو ( وەك : کوڕم ... کوڕمان ... ) ناوەکە ببێتە ناوی کەسی ؛ یـان کـە بـە پریپۆزیشنەوە دەلکێ ( وەك : لـەم ... لەمان ... ) ، ئەوە پریپۆزیشنەکە ببێتە پریپۆزیشنی کەسی ...**

**(٩٤) دەرکەوتنی ( ە ) وەك جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی دەسـتەی دووەم لەگەڵ جێناوی خۆیی ( خۆ )دا بەڵگەیەکی ترە بخرێتە سـەر ئەو بەڵگانەی لە وتاری « جێناوی کەسـیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا »دا بۆ ئیسپاتکردنی بە جێناو دانانی ( ە ) هێناومانەتەوە .**

٤ ـ دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە دەلکێ ، وەك :

خۆ + م + ٠ ⟵ خۆمم

**... کە چاوم بەوانە کەوتو ئەو ئەحوالەم دی بە جارێك خۆمم لەبیرچووەوە .**

( لە خەوما ، ل ٣٩ )

**خەڵك هەموو مەسرووورو شادن دەستە دەستە دێنە خوار**
**من خەریکی دەردی خۆمم ، تەرکی ناو یاران ئەکەم**

( بێ‌کەس ، ل ١٧٥ )

خۆ + ت + ت ⟵ خۆتت

**یاخود بە قەولی گاڵتەی درۆزن**
**کەرەکەی خۆتت لێبووە ڕەو زن**

( پیرەمێرد ، ل ٣٠٢ )

خۆ + ت + ی ⟵ خۆتی

**خۆتی(٩٥) فیداکەی هەر کەمە**
**خەلاتی ئەو دەردو غەمە .**

( بێ‌کەس ، ل ١٦٢ )

خۆ + م + تان ⟵ خۆمتان

**خۆمتان لێناگۆڕم**

خۆ + تان + مان ⟵ خۆتانمان

**خۆتانمان لێ مەشارنەوە**

**... هتد(٩٦) .**

---

(٩٥) واتە : ( خۆت فیدای ئەو کەی ) .

(٩٦) کاتێ دوو جێناوی دەستەی یەکەم دەچنە سەر جێناوی خۆیی (خۆ) ، ⟵

٥ ـ جێناوێکی دەستەی یەکەم‌و بە دوایدا هی دەستەی دووەم ، وەك :

خۆ + م + ن ← خۆمن

**ئەوان وەك کوڕی خۆمن**

خۆ + ت + ن ← خۆتن

**ئـەوان لـە خۆتن**

خۆ + ت + ین ← خۆتین

**ئێمە لـە خۆتین**

خۆ + مان + ین ← خۆمانین

**ئەوە کێ‌یە لە دەرگا دەدا ؟ خانم بیکەرەوە خۆمانین**

خۆ + تان + ین ← خۆتانین

**ئێمە لـە خۆتانین**

٦ ـ کاتێ ( خۆ ) جێناوی لکاوی دەچێتە سەر چ لـە پێش‌و چ لـە پاش جێناوەکەوە مۆرفێمی ( ش/یش ) دەتوانێ وەربگرێ • وەك :

أ ـ لە پێش جێناوەکەوە :

خۆشم ، خۆشت ، خۆشی ، خۆشمان ، خۆشتان ، خۆشیان •

**لـەبـەر تـۆ زەربـەم داوە لـە خۆشم**

**وا تێ‌گەیشـــتم کـە چەند بێ‌هۆشـــم**

( بێ‌کەس ، ل ٧٧ )

---

هەمیشە ئەوی یەکەم بەرکارەو ئەوی دووەم کارایە . بەوێنە :

**خۆتم نیشان بدە ـ تۆ ( بەرکار ) خۆت بە من ( کارا ) نیشان بدە •**

**خۆیتان لێ‌ون‌دەکا ـ ئەو ( بەرکار ) خۆی لە ئێوە ( کارا ) ون‌دەکا •**

**خۆیانمان لێ‌دەشارنەوە ـ ئەوان ( بەرکـار ) خۆیان لە ئێمە ( کـارا ) دەشارنەوە •**

پیرەمێردێك بوو ، چوارپێنج ولاخی پێبوو ، خۆشی تەنها بوو ..

( لە خەوما ، ل ٣٠ )

کــە خۆیشـــــیان ئەیانمژین ،
بــۆ خەڵقیشـــیان ســەرئەبڕین !

( گۆران ، ل ٨٧ )

ب ـ لە پاش جێناوەکەوە :

خۆمیش ، خۆتیش ... خۆمانیش ، خۆتانیش ...
خۆتانمانیش ، خۆمتانیش[٩٧] ...

٧ ـ جێنـــاوی ( خۆ ) لەگـــەڵ کرداردا بەو جۆرەی خوارەوە خـــۆی دەنوێنێ :

أ ـ کاتێ جێناوێکی دەستەی یەکەمی پێوە لکابێ لەگەڵ کــرداری تێپەڕو تێنەپەڕیشدا دێ . وەك :

خۆمان ـ فرۆشتمان ، کوشتمان ...
خۆمان ـ چووین ـ کەوتین ...

ب ـ ئەگەر دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە لکابێ ، تەنیا لەگەڵ کرداری تێپەڕدا دێو لەگەڵ تێنەپەڕدا نایەت ، وەك :

خۆمانمان ـ فرۆشت ، کوشت ...
خۆمانمان ـ × ، ×

ج ـ پێتوو جێناوێکی دەستەی دووەم یان جێناوێکی دەستەی یەکەمو بە دوایدا جێناوێکی دەستەی دووەمی چووبێتە ســەر ، ئـەوە لەگەڵ هیچ جۆرە کردارێکدا نایەت .

---

(٩٧) ئەگەر دوو جێناوی لکاو بە دوا ( خۆ )دا هات ، حاڵەتی ( ش/یش ) کەوتنە نێوان دوو جێناوەکەشەوە هەیە ، وەك : خۆتانیشـــــــمان ، خۆمیشـــــتان ...

٨ ـ جێناوی ( خۆ ) دەتوانێ ببێتە بەشێکی گرنگی وشەی ناســـادە • وەك :

أ ـ لە وشــەی دارێژراودا :

یەك ـ لەگەڵ پێشگر

بەخۆ ••••

دوو ـ لەگەڵ پاشگر

خۆیەتی ، خۆیی

ب ـ لە وشەی لێکدراودا :

یەك ـ لەسەرەتاوە :

خۆکرد ، خۆماڵی ، خۆپەرســـــت ، خۆناســـــین ، خۆبەختکردن ، خۆپەسەندی •••

**کەس بــە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردییە خۆکردییە**
**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی طالبی مەعنا دەکـا**

( نالی ، ل ١٠٧ )

**خۆبەســەندی مایــەی ڕیســـــــــوایی‌یە**

( پەندی پێشینان ، ل ١٩٣ )

دوو ـ لەکۆتاییەوە :

سەربەخۆیی ، لەسەرخۆ ••••

**داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قــەت بــەر ناگرێ**
**ســەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبــەد ســـــەر ناگرێ**

( بێکەس ، ل ٨٢ )

٩ ـ جێناوی ( خۆ ) چ لە زوودا و چ ئەمڕۆ ، چ ســـەربەخۆ و چ لــە پێکهێنانی وشەی ناسادەدا ناوەناوە لە شێوەی ( خود )دا دەبینرێ • وەك :

**کـــه هاتی تیغی بێزاریت لـەرســـــە دام**
**سەری خۆم خود بە خود هەلگرت‌و ڕۆییم**

( نالی ، ل ٣١٤ )

**هەرکەسێ ئیظهـاری دانایی بکـات‌و مەقصــــــەدی**
**خودپەســـــەندی بێ ، یەقین ئیظهاری نادانی دەکـا**

( نالی ، ل ١٠١ )

جێناوی خۆیی لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا لە ڕووی جینس[٩٨]و ژمارەو دۆخەوە بێ‌لایەنەو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا هـەر بـەو چەشنەیە :

چەند نموونەیەك :

* بـۆ نێر :

**هەما مەم ڕابوو لنگی خوە ئاڤێتە جۆتی سۆلانە .**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٣ )

**عەلی مەمەد ... ڕۆنیشت‌و خۆ دا بەر تەعقە ....**

( کوردۆ ، ل ٣٤ )

---

(٩٨) بەوێنە ، ئەوەتە بۆ کەسی سێیەمی تاك چ مێ بێ‌و چ نێر هەر ( خۆی ) بەکاردێنرێ .

أ ــ بۆ مێ :

**ئەزانێ یار خۆی ، کام هەژار ، ڕۆژی سەدجار ،**
**ئەکا هاوار : خۆزگەم بـە پـار ، خۆزگەم بە پار !**

( گۆران ، ل ٢٣ )

ب ــ بۆ نێر :

**ئەوانیش وتیان ... هاتووە لێرە کاسبیەك بکا بۆ خۆی ...**

( لە خەوما ، ل ٣٣ )

* بـۆ مێ :

**خۆشـــکەك مــە هەبوو ڕەنگێ سـۆرگول**
**هــەڵگــرتیـیە وێ ژ بــۆ خــوە بلبــل**

( خانی ، ل ٢٨٨ )

* بـۆ تـاك :

**عەلی مەمەد ... دلێ خۆدا گۆت : ...**

( کوردۆ ، ل ٣٥ )

**شــــــەفقێ ب دیـداریٚ خــوە کت**
**قەســـــــتا برینــــداریٚ خــوە کت**

( جزیری ، ل ٤٥٥ )

* بـۆ کـۆ :

**ڕۆژەکی دەرکەتن ، چوون سەر کانییا گولانە ،**
**ژ خــۆە دانین پۆســــــــــتێن کــەوانە ،**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٥ )

* بـۆ دۆخی ڕاستەوخۆ :

ل **ســـــینانا نافێ ســــلێمان دەرباز بوو ، خۆ بــەردا کورانــا بشیرێ ...**

( ئۆردیخان ، ل ٨٠ )

* بـۆ دۆخی تیان :

**هــەم ئەهلێ نەزەر نــە بێن کــو : کورمانج**
**ئیشــــــقێ نەکـرن ژ بــۆ خوە ئامــانج**

( خانی ، ل ٦٠ )

... هتد .

* * *

# جێناوی نیشـانه

له زمانی ئاوێستادا « ته ، ئەیتە ، ئەیم » ( ئەم ، ئەمە ) ؛ « هاو ، ئەڤه » ( ئەو ، ئەوه )[99]و له زمانی سانسکریتیدا « تا ، ئینا ، ئەیـام » ؛ « ئەوساو » ( ئەو ، ئەوه )[100] جێناوی نیشانەن ... له ئاوێســـــتاش‌و سانسکریتیشدا زۆری ئەو جێناوانه ژمارەو جنس‌و دۆخیان هەیه[101] .

له زمانی فارسیی ناوەڕاستدا « ئێن ، ئێـ ( ت ) » ( ئەم ، ئەمه ) ؛ « ئان ، ئۆی » ( ئەو . ئەوه ) جێناوی نیشانەی سـەرەکین‌و جاروبارەش « ئیم » ( ئەم ، ئەمه ) بەرچاودەکەوێ ... جێناوی « ئۆی » ( ئـەو ، ئەوه ) فۆرمی کۆی هەیه ـ « ئۆشان » ( ئەوان ، ئەوانه ) . لـه هەندێ حاڵەتدا جێناوی « ئێـ ( ت ) » ( ئەم ، ئەمه )یش « ئاته / ئەشـــــان » ( ئەمان ، ئەمانه ) فۆرمی کۆیەتی . هەرچی جێنـاوی « ئێن » ( ئـەم ، ئەمه ) و « ئان » ( ئەو ، ئەوه )یه فۆرمی کۆیـــان نییـــه ... تێکڕای جێناوەکانی نیشانەی زمانی فارسیی ناوەڕاست دۆخیان نییه[102] .

له زمانی فارسیی نوێدا « این »و « آن » جێناوی نیشانەن . « این » بۆ نزیك‌و « آن » بۆ دووره . ئەم دوو جێناوه ئەگەر بۆ کـەس بن لـــه حاڵەتی کۆدا دەبنه « اینان ، آنان » ، بەڵام ئەگەر بۆ شت بن لـــه حاڵەتی کۆدا دەبنه « اینها ، آنها »[103] .

---

(99) A.V. Wiliams Jackcon, Avesta Grammar, Part 1, Stuttgart W. Kohlhammer, 1892. PP. 117-122.

(١٠٠) هەمان سەرچاوه . ل ١١٧ – ١٢٢ .

(١٠١) هەمان سەرچاوه . ل ١٢٣ .

(١٠٢) ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆســـــکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٦٢ .

(١٠٣) علی برناك ، دستور زبان فارسی ، ١٣٤٧ ، ل ٢٧ .

جێناوەکانی نیشانە لە زمانی کوردیدا وێڕای نزیکی شێوەیان لەگەڵ جێناوەکانی نیشانەی ئەو زمانانەی خزمایەتی‌یان لەگەڵیان هەیە ، لە ڕووی بەکارهێنانیشیانەوە زۆر وێك‌دەچن •

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا ( ئەم ، ئەمە ، ئەمان ، ئەمانە ) و ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) جێناوی نیشانەن • کۆمەڵی یەکەمیان ، واتە ـ ( ئەم ، ئەمە ، ئەمان ، ئەمانە ) بۆ نزیك‌و کۆمەڵی دووەمیان ، واتە ـ ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) بۆ دوور بەکاردێن ••• هەرچی ( ئەم ، ئەمە )ی کۆمەڵی یەکەم‌و ( ئەو ، ئەوە )ی کۆمەڵی دووەمە تاکن‌و بە یاریدەی ( ان )ی کۆ بوونەتە ( ئەمان ، ئەمانە )و ( ئەوان ، ئەوانە )ەو جێناوی نیشانەی کۆ سازبووە •

بەو پێیە جێناوەکانی نیشانە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا لە شێوەی ئەو خشتەیەی خوارەوەدا دەبینرێن :

| | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| نزیك | ئەم ، ئەمە | ئەمان ، ئەمانە |
| دوور | ئەو ، ئەوە | ئەوان ، ئەوانە |

**چەند سەرنجێك :**

١ ـ فۆرمی ( ئەم ، ئەو ) ـ ( ئەمان ، ئەوان ) دەگمەن بە تەنیا دەبینرێن ، بەلاّم کاتێك جێناوی لکاو یان مۆرفیمی ( ش/یش ) ••• دێتە سەریان چالاك بەدەردەکەون • وەك :

ئـەمم ، ئەميـان ، ئەمتـــان ...
ئـەوم ، ئەويـان ، ئەوتـان ...
ئەمانم ، ئەمانيان ، ئەماتتان ...
ئەوانم ، ئەوانيان ، ئەواتتان ...
ئەميش ... ئەويش ... ئەمانيش ... ئەوانيش ...

٢ ـ كاتێ جێناوی نیشانەی ( ئەمە )و ( ئەوە ) لە ڕستەیەکدا دێـن کە وشەی سەرەی تێدایە ، ( ە )ی کۆتاییان دەچێتە سەر وشە سـەرەکە . وەك :

ئەم کوڕە ئازایە ( ئەم ... ە )
ئەو کوڕە ئازایە ( ئەو ... ە )

بەڵام یێتو وشە سەرەکە نەبێ ، ئەوە ( ە ) دەچێتەوە شوێنی خۆی . وەك :

ئەمە ئازایە ( ئەمە )
ئەوە ئازایە ( ئەوە )(١٠٤)

---

(١٠٤) مامۆستا نووری عەلی ئەمین‌و دانەرانی کتێبی « زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی »و هەندێکی دی لەو ڕایەدان کە لـە حاڵەتی یەکەمدا ، واتـە لـە ڕســـتەکانی ـ ( ئەم کوڕە ئازایە )و ( ئەو کوڕە ئازایە )دا ـ ( ئەم ... ە )و ( ئـەو ... ە ) ئاوەڵناون‌و لـە حاڵەتی دووەمدا ، واتە لە ڕستەکانی ـ ( ئەمە ئازایە )و ( ئەوە ئازایـە ) دا ـ ( ئەمە )و ( ئەوە ) جێناوی نیشـــــانەن ... ( بڕوانە : نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، ســـــلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٩٧ ، ١٢٠ . عەبدوللا شالی ، دە عیزەدین مستەفا ڕەســــوول ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین . فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سەندی ، زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٨٥ ـ ٩٤ .

٣ ـ دەمێ ( ان )ی کۆ دەچێتە سەر ( ئەمە )و ( ئەوە ) ، دەکەوێتە نێوان ( ئەم ) و ( ە ) ؛ ( ئەو ) و ( ە )ەوە . ( ئەمانە ) و ( ئەوانە )ش کە لە ڕستەیەکدا دێن وشەی سەرەی تێدابێ ( ان + ە ) دەچێتە سەر وشـــە سەرەکە . وەك :

ئەم کوڕانە ئازان ( ئەم ... ان ... ە )

ئەو کوڕانە ئازان ( ئەو ... ان ... ە )

ئەگەر وشە سەرەکە نەبێ ، ئەوە ( ان + ە ) دەچێتەوە سەر ( ئەم )و ( ئەو ) . وەك :

---

هۆی ئەم بۆچوونە ئەوەیە ، کە لە ڕێزمانی چاولێکەریی کوردیو گـەلێ زمـــانی تـردا زاراوەی جێنـــاو ، ڕانـــاو ـ (Pronoun) زۆر جار تەنیا بۆ ئەو وشانە بەکاردەهێنرێن ، کە لە ڕستەدا هەمـــان دەوری ناو دەبینن ، واتە ـ زاراوەی ناوبراو لە ڕووی ئیتیمۆلۆژییەوە بە واتای دەقاودەقی ( جێ ـ ناو ؛ ڕا ـ ناو ) : (Pro – noun) – وەردەگرن ، کە گوایا لەجێی ناو ، لەبریتی ناو دێت ... بـــەو پێیە وشەی وەك ( ئەم ، ئەو ... ئەمە ، ئەوە ... )و گەلێکی‌تر کە ئەرکی ئاوەڵناو دەبینن ، نابێ لە ڕیزی جێناو دابنرێن ... لێرەدا پێویسـت بەوە ناکا بە دوورو درێژی لە نادروســـتیو ناڕاســـتی ئەو جۆرە تێگەیشتنەی جێناو بدوێین ، کە تەنیا لەســـەر بناغەی ئیتیمۆلۆژیی زاراوەکە بنیاتنراوە . لە ڕاستیدا ئەگەر وشـــەی ( ئەم ، ئەمـــە ... ئەو ، ئەوە ... ) جێناو نەبێو ئاوەڵناو بێ ، لەســـەر بناغەی ئەوەی جێی ناو ناگرێ ، بەڵکو لەبریتی ئاوەڵناو دێ ، ئەوە ئاشکرا نییە بۆچی وشەی وەك ( من ، تـــۆ ... ) هەر ئەو ئەرکە دەبینن کە ناو دەیبینێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەناو دانانرێن . کەواتە ، ئـــەگـــەر ( ئـــەم ، ئەمە ... ئەو ، ئەوە ... ) بە ئاوەڵناو دابنرێن ، ئـــەوە دەبێ بەپێی هەمان تێگەیشتنو بۆچوون وشەی ( من ، تـــۆ ... ) لە ڕســـــتەی ( من کوڕێکی ئازام )و ( تۆ کوڕێکی ئازای/ت )دا بە ناو بژمێررێنو لە ڕستەی ( من ئازام )و ( تـــۆ ئازای/ت )دا بە جێناو دابنرێن .

ئەمانە ئازان ( ئەمانە )
ئەوانە ئازان ( ئەوانە )

چەند نموویەك :

ئـەم ... ە

**ئەم دێـیـە جێدێلم : بێنیشان ، بێشوێنپێ .**
**ئەی پـەری ! ســـڵمەکە ، لا مەدە بـۆ لارێ !**
( گۆران ، ل ٢٦ )

ئـەمـە

**ئەمە جێی ڕەمزو ئیشاراتی دەروونە ، لـە گەرووی**
**تەنگی پـڕ غەرغــەرەیی واعیظی غـەرِڕا نییە بـاس**
( نالی ، ل ٢٣٥ )

ئەمـانـە

**دەم‌و لێــوی وەك گـــوڵی بـەربـەیـانی**
**ئەمـانـە گشت ... گەلێکی تریش جوانی**
( گۆران ، ل ٤٧ )

ئەو ... ە

**ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد**
**مژدەی بەیانی بـۆ گـەلی دوورو نزیك ئەبـرد**
( پیرەمێرد ، ل ١١٩ )

ئـەوە

**کێیە تـا ســـەر لـە فەزای دەردو غەمابێ مابێ**
**ئـەوە هەر کوردە کـە چاوی لـە هەوابێ ، وابێ**
( زێوەر ، ل ١٦ )

ئەوانــە

**پێی ناوێ بــۆ شەهیدی وەتەن شیوەنو گرین**
**نــامــرن ئەوانــە وا لـــە دڵی میللەتــا ئەژین**

( پیرەمێرد ، ل ۱۲۰ )

جێناوی نیشـــانەش ، هەروەك جێنـــاوی خۆیی ، جێنـــاوی لکاو وەردەگرێ . وەك :

ئەم + یان ⟵ ئەمیان

ئەم + مان ⟵ ئەممان

**ئەمیـــان یەخەمــان ئەگــرێ ،**
**جــوابی ئــەممان پێ نــادرێ ،**

( گۆران ، ل ۱۰۸ )

ئەمە + مان ⟵ ئەمەمان

**هاتنە لام وتیــان : تــۆ ڕابەرمان بــە**
**ئەمەمــان بۆ بکەو تاجی ســەرمان بــە**

( پیرەمێرد ، ل ۱۵۸ )

ئەم + یان ⟵ ئەمیان

ئەو + یان ⟵ ئەویان

**ئەمیــان ئــاوازی شـــادی**
**ئەویــان نووزەی بەربــادی**

( گۆران ، ل ۱۰۵ )

ئەمانە + م ⟵ ئەمانەم

**ئەمانــەم گشت لا جوان بووەو جوانــە ،**
**بەڵام هەرگیز تەنیـــا جوانیی ئــەمـانــە**

( گۆران ، ل ٤٨ )

ئەوە + یان ⟵ ئەوەیان

**لــە تەختێك هەڵدەستێ هەزارو یــەك نەغمە !**

**ئەوەیــان شــــــیرینتر دێتە گوێم زۆر نزمە !**

**( گۆران ، ل ٤٦ )**

ئەوە + ن ⟵ ئەوەن

**... وتی باوکم ئەمانە بە هیوای ئەوەن شتێکیان بدرێتێ ...**

**( لە خەوما ، ل ٣٤ )**

**... هتد .**

کاتێ جێناوی نیشانە جێناوی لکاوی دەچێتە سەر تەنیا لـــە پێش جێنـــاوە لکاوەکەوە مۆرفێمی ( ش/یش ) دەتوانێ وەربگرێ ، نەك وەك جێناوی خۆیی کە دەتوانێ چ لە پێشیەوەو چ لە پاشیەوە بێت . وەك :

ئەمیشم ، ئەمەشم ، ئەمانەشم ، ئەویشم ، ئەوەیشم ، ئەوانەشم ...

ئەم + یش ⟵ ئەمیش

**ئەگەر خوێنم دەرێژی تۆ ، ئەوە تیغو ئەمیش گەردن**

**ئەگەر بنیادی پەیمان ، دەســتی من دامێننە ، بازا !**

**( نالی ، ل ٩٦ )**

ئەمە + ش ⟵ ئەمەش

**... هەزارتان بۆ دنیا کردووە ، ئەمەش بۆ خوا بکەن .**

**( لە خەوما ، ل ٣٧ )**

**... هتد .**

لەنێو جێناوەکانی نیشانەدا ، بەتایبەتی ( ئەم ) لە پێکهێنانی وشـەی لێکدراودا سەرنج ڕادەکێشێ . وەك :

**هـەوای هاوینـە ، هـەوای هاوینـە**
**ئەمسـاڵ هاوینمان زۆر لێ بەفینـە**

( پیرەمێرد ، ل ١٠٨ )

**ئەمڕۆ بـە بەفرو تەرزە ئەتۆی خسـتە زەمهەریر**
**هاوین کـە هاتە پێشەوە بەفراو ئەخاتە دەشـت**

( زێـوەر ، ل ٦٠ )

ئەمڕۆ کە دەوترێ ( بەم ، لەم ، بەمە ، لەمە ، بەمانـە ، لەمـانـە ) ؛ ( بەو ، لەو . بەوە ، لەوە ، بەوانە ، لەوانە ) ، ئەسـڵەکەیان ( بە ئەم ، لە ئەم ، بە ئەمە ، لە ئەمە ، بە ئەمانە ، لـە ئـەمـانـە ) ؛ ( بە ئەو ، لە ئەو ، بە ئەوە ، لە ئەوە ، بە ئەوانە ، لە ئەوانە ) بووەو ( ئە/ە )کەی سەرەتایان تێچووە . لە ئاخاوتن‌و نووسینی ئەمڕۆی کوردیدا لەوانەیە بڵێین خەڵك هەموو وشـەکان بە یەکەوە دەڵێن‌و بە یەکەوە دەیان‌نووسن ـ واتە مەودا ناخەنە نێو پریپۆزیشـنەکەو وشـەی دوایەوە[١٠٥] .

چەند نموونەیەك :

بەم ( بە ئەم )

**گوناهم چی بوو بـەم دەردەت بردم ؟!**
**بۆچی بـە ناهەق وا سووکت کردم ؟!**

( بێ‌کەس ، ل ٧٧ )

---

(١٠٥) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێنووسی کوردی لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٩٧ ـ ١٠٢ .

لـەم ( لە ئەم )

**لـەم گەردشی مینایـە کـە وا دوورە ، نە جەورە**
**سـاقی کەرەمی سـایقە ، « نالی » مەکە ئیلحاح**

( نالی ، ل ١٦٧ )

بـەو ( بە ئەو )

**گریـانی منو خەنـدەیی تـۆ ئێسـتە دەشوبهێ**
**بـەو مەوسیمی بارانە کە وا خونچە دەپشـکووت**

( نالی ، ل ١٥٣ )

لـەو ( لە ئەو )

**لـەو نیعمەتـەی پێی داوی**
**تـۆزێـکی نـەك تـەواوی**

( گۆران ، ل ١٠٥ )

... هتد .

لە ناوچەی موکریانو سۆران ... دا ( هۆو[١٠٦] ، هۆوە ، هۆوانە ، هەو[١٠٧] ... )یش : وەك جێناوی نیشانە بەدەردەکەون :

**چاوەکـەم تۆش پیـر دەبی ڕیشـت دەبێتە گۆرەوی**
**وەك بفەرمووی من فلانم پێت دەڵێن توخـوا هـەوی**

( کۆیی ، ل ٤٧ )

لە بەشە دیالێکتی کرماشـانـدا « یە » ( ئەم ، ئەمە ) ؛ « یـانـە » ( ئەمان ، ئەمانە ) ؛ « ئەڤە » ( ئەو ، ئەوە ) ؛ « ئەڤانە » ( ئەوان ، ئەوانە )

---

(١٠٦) لە ئاوێستادا جێناوی ( تە ) ، کە بە واتای ( ئەم ، ئەمە ) دێت ، لە دۆخی تیاندا ئەگەر بۆ تاکی نێر بێ ، دەبێ بە ( هۆ ) .

(١٠٧) جێناوی نیشانەی ( هەو )ی کوردی بەرانبەر ( هاو )ی ئاوێستا دەوەستێ ، کە هەردووکیان واتای ( ئەو ، ئەوە ) دەبەخشن .

جێناوی نیشانەن • شێوەی ئەو جێناوانە لە زاری هەورامیشدا بەو جۆرە « ئینە » ( ئەم ، ئەمە ) ؛ « ئینێ » ( ئەمان ، ئەمانە ) ؛ « ئانە » ( ئەوە ) ؛ « ئانێ » ( ئەوان ، ئەوانە ) دەبینرێ (١٠٨) و (١٠٩) •

... هتد •

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ( ئەڤ ، ئەڤە ، ئەڤان ، ئەڤانە ) و ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) جێناوی نیشانەن • لەم دیالێکتەشدا ، هەروەك لە دیالێکتی خوارووودا کۆمەڵی یەکەمیان ، واتە ـ ( ئەڤ ، ئەڤە ، ئەڤان ، ئەڤانە ) بۆ نزیكو کۆمەڵی دووەمیان ، واتە ـ ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) بۆ دوور بەکاردێن • هەرچی ( ئەڤ ، ئەڤە )ی کۆمەڵی یەکەمو ( ئەو ، ئەوە )ی کۆمەڵی دووەمە تاکنو بەیارمەتی ( ان )ی کۆ بوونەتە ( ئەڤان ، ئەڤانە ) و ( ئەوان ، ئەوانە )و جێناوی نیشانەی کۆ سازبووە •

چەند نموونەیەك :

ئەڤ ـ

هێژا نە زەمین نە ئەڤ سەما بوو
ئەو سەروەرێ جملە ئەنبیا بوو
( خانی ، ل ٣٦ )

---

(١٠٨) بڕوانە : دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، تهران ، ؟ ، ل ١٢ ـ ١٣ •

(١٠٩) « ئینە »ی هەورامیو « ئینا »ی سانسکریتی زۆر وێكدەچن ... « ئینێ »ی هەورامانی لە « ئێن »ی فارسیی ناوەڕاست نزیکە ... « یانە »ی کرمانشانیو « ئانە »و « ئانێ »ی هەورامی لە « ئان »ی فارسیی ناوەڕاستو ( آن )ی فارسیی نوێ دەکەن ... « ئەڤە »و « ئەڤانە »ی کرمانشانی وەك هی کرمانجیی ژووروووە ...

ئەڤە(١١٠) ـ

ڕۆژەکی وێ تێکەڤە دەست ، ئەڤە جەنەومرێ وەکی هەسپانە ،
( مەمێ ئالان ، ل ٤٢ )

ئـەو ـ

عەلی مەمەد ئەو خەبەردان بهیستنو ژ خوەڕا گۆت : ...
( کوردۆ ، ل ٤٤ )

ئـەوە ـ

ســـەرچەشـمەیا حوســـــــنێ ئـەوە
خورشـــــــیدەو عـــالـەم پـەرتـەوە
( جزیری ، ل ٥١ )

... هتد .

لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی ســـۆڤێتدا : هان / هانا / هانـە ؛ وا هـا / ئاوها / ئاهـا / هاوا / هایـا(١١١) ... یشـــــن جێنـــاوی نیشـانەن(١١٢) .

جێناوەکانی کۆمەڵی دووەم لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا خاوەنی یەك فۆرمن و ( ئەو ) بناغەی هەموویانە . بنـاغـــەی جێنـاوەکانی دەستەی دووەم لە دیالێکتی خواروودا ( ئەم )ەو لـە دیالێکتی ژووروودا ( ئەڤ )ە . ئەو جیاوازییە کەمەی لـــە بوونی دەنگی ( م ) بـە ( ڤ )دا

(١١٠) لە ئاوێستادا هەمان جێنـاوی نیشـانـەی ( ئەڤە ) بەدیدەکـرێ . تەنیا ئەوەندە هەیە ، ئەم جێناوە لە دیالێکتی ژووررووی زمانی کوردیدا بۆ نزیك بەکاردێ ، بەڵام لە ئاوێستدا بۆ دوور .

(١١١) زوربەی ئەو فۆرمانە لەگەڵ جێناوەکانی نیشانەی زمانی ئاوێســـتا یان فارسیی ئاوەڕاست یەكدەگرنەوە .

(١١٢) بڕوانە : چ. خ. بەکۆ ( باکاییێف ) ، زمانی کوردەکانی ســـــۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٤٣ ـ

بەرچاودەکەوێ لە یاسای فۆنەتێکی کوردیدا دیاردەیەکی ئاشکراو ڕوونە .

لە هەردوو دیالێکتی کوردیدا جێناوی نیشانە شێوەی تاكو کۆی هەیە . لە دیالێکتی خواروودا نێرو مێ وەك یەکە ؛ بەلام لە دیالێکتی ژووروودا بەتایبەتی لە دۆخی تیاندا ڕەسەنی نێرو مێی جیادەکرێتەوە .

( ئەڤ . ئەو ) ئەگەر بۆ نێر بەکاربهێنرێن ( ی ) وەردەگرنو دەبنە ( ئەڤی ، ئەوی ) ، بەلام بێتو بۆ مێ بوترێن ( ێ )یان دەچێتە سەرو دەبنە ( ئەڤێ . ئەوێ ) ... زۆر جاریش ( ە / ئە )ی سەرەتایان تێدەچێو لە شێوەی ( ڤی . وی ) ؛ ( ڤێ ، وێ )دا دەبینرێن[113] ...

بە وێنە :

**هەما مەم ڕابوو لنگێ خوە ئاڤێتە جۆتێ سۆلانە .**
**داگەت حەوشێو چوو بەر کەندالێ بەحری ئەڤی گەلەك خۆرتانە دیت ...**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٣ )

**ژنا وی کەربوو ، لێ دیسا ژی باوەڕ نەکر ، ڤێلێ خوە نەتەرکاند ، بیرە خوەدا هشت ، کو ڕۆژەکێ ئەڤێ یەکێ بزانبە .**
( کوردۆ ، ل ٤٣ )

**عەلی مەمەد ل وی ماعری نهێرێو ....**
( کوردۆ ، ل ٣٤ )

**ئەمە د شکلێ کەفتن ، وێ چاخێ ، ئەمێ خوە باڤێژن دەڤێ گولەکانە .**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٦ )

---

(١١٣) شایانی باسە د. کوردستان موکریانی ئەو ڕاستییەی خستۆتە پێش‌چاو ( بڕوانە : د. کوردستانی موکریانی ، جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕستەی کوردیدا لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و کرمانجیی ژووروودا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٤٢ .

# جێناوی پرسیار

لەگەڕانو پشکنین بە دیالێکتو بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا چەند دەستەیەك جێناوی پرسیار دێنە پێش‌چاو :

١ - کێ / کی .

٢ - چی / چ / چە .

٣ - کام / کامە / کێهە / کێها / کێهان / کیژان .

٤ - چۆن , چلۆن / کوو / چەوا(ن) / چاوا(ن) .

٥ - کەی , کەنگێ / کەنگی / کەنگین / کەنگینێ / کەینێ .

٦ - کوا / کوانێ / کا / کانێ .

٧ - کوێ , کوێندەرێ / کیرێ / کیدەرێ / کوێدەرێ / کوو .

٨ - چەند , چەن / چەنگ .

**کێ / کی**

ئەم جێناوە بۆ پرسیاری ئەو کەسە بەکاردەبرێ ، کە کارێکی کردبێ یان بیکا ...

وێکچوونو نزیکیی ئەم جێناوە لەو زمانە کۆنو نوێیانەی لەگەڵ کوردیدا خزمایەتی‌یان هەیە ، دەبینرێ . بە وێنە : لە ئاویستادا « کە »(١١٤) ؛ لە فارسیی کۆنو هیندیی کۆندا « کەیە »(١١٥) ؛ لە

---

(١١٤) بڕوانە : س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٦٦ .

(١١٥) بڕوانە : ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣٠ .

فارسیی ناوەڕاستدا « کێ »(١١٦) ، لە فارسیی نوێدا « کە »(١١٧) ، لە بلووجیدا « کێ / کە »(١١٨) ... یە .

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا ( چ لە زمانی ئەدەبیو چ لە بەشە دیالێکتەکانی موکریانو سۆراندا ) چۆن لە زوودا تەنیا فۆرمی ( کێ ) بەکاردەهێنرا ، ئەمڕۆش بە هەمان چەشن هەر فۆرمی ( کێ ) بەکاردەهێنرێ . لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ئەگەرچی هەردوو شێوەی ( کێ )یشو ( کی )یش هەیە ، بەڵام ( کی ) زۆرتر بەکاردێنرێ . هەرچی ( کێ )یە پتر لە دۆخی تیاندا دەبینرێ ...

لە دیالێکتی خواروودا :

**کێ دەستی دەگاتە بەیو ناری نەگەیشتووت**
**لەو تەختە کە وا صاحیبی مۆرن بە صەدارەت ؟**

( نالی ، ل ١٤٦ )

**کێ کردی ، کێ بردی ؟**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٥٦ )

**کێ وا : لە ژێر زنجیرا**
**ئازادیی هات بە بیرا ؟**

( گۆران ، ل ٨٥ )

---

(١١٦) بڕوانە ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ . ١٩٦٦ ، ل ٦٥ ــ ٦٦ .

(١١٧) بڕوانە :

أ ــ ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٣٢ .

ب ــ علی برناك ، دستور زبان فارسی ، ١٣٤٧ ، ل ٣٤ .

(١١٨) ف. ئا. ئورولۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٣٤ .

**میر زێنـــدین ناردیه کن قەرەتاژدینی : « کێ مواجبی لێبڕیوە ؟ کێ قسەی پێگوتوە ؟ ...**

( تحفەء مظفریه ، ب ۱ ، ل ۲۸۵ )

**ئــەو کانیـیــەکــەی لــــە ســــێبەرێ**
**بــــە خــــۆم لێدا بــــە خەنجــــەرێ**
**کێ ئــاو لێبــرد زەردئەســـــــــەرێ**

( فۆلکلۆر ، ل ٦٢ )

لــە دیالێکتی ژووروودا :

**کی دبیـــژە دۆیێ من ترشــــــە ؟**

( کوردۆ ، ل ۲٤۳ )

**ئەڤ ڕەنگ کێ دیوە ب ســــــوڕ**
**قــودرەت نموون زەنگــارێ ( خط )**

( جزیری ، ل ۲٤۸ )

**کی دەردێ کێ دزانە ، هەر کەی دەردێ خوە دزانە .**

( کوردۆ ، ل ۲٤۳ )

**چی / چ / چە :**

ئەم جێناوە بۆ پرسیار لە شتو هۆی ڕووداو بەکاردێنرێ .

لە ناوچەی سلێمانی بـــە زۆری شێوەی ( چی ) دەوترێو کــــەمێ جاریش ( چ ) . لە ناوچەی خانەقینو سنەو کرماشان ... ( چە ) دەڵێن . لــــە بەشــــە دیالێکتی موکریان(۱۱۹)و ســــــۆرانو دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا(۱۲۰) ( چ ) باوە ، بەڵام لە دۆخی تیاندا هەمیشە دەبێ بە (چی) .

---

(۱۱۹) بڕوانە : ك. ڕ. ەیووبیو ی. ئا. ســــمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ۱۹٦۸ ، ل ٤۸ ) .

(۱۲۰) بڕوانە : ق. کوردۆییێف ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆســــکۆ ، ۱۹٥۷ ، ل ۱۰۹ .

ئەم جێناوە لە ئاوێستادا لە شێوەی « چەهیە »[121] ؛ لە فارسیی ناوەڕاستدا « چێ »[122] ؛ لە فارسیی نوێدا « چ »[123] ؛ لە بلووجیدا « چ ، چێ »[124] ... دەبینرێ .

نموونە :

**گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟!**
**بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم ؟!**

( بێکەس ، ل ٧٥ )

**چی بە جێما لە دوایان**
**بۆ دۆست و ئاشنایان ؟**

( گۆران ، ل ٨٩ )

**هەباسە ، لە دیوەخانان چ باسە ؟**

( پەندی پێشینان ، ل ٤٧٤ )

**میر گوتی : « کوڕینە ئەمە چ بکەین ..... ؟ »**

( تحفهء مظفریه ، ب ١ ، ل ٣١٨ )

**میر گوتی : « ... بەکر ئاغا ، ئەتوو چی دەدەیێ ؟ ... »**

( تحفهء مظفریه ، ب ١ ، ل ٣١٨ )

**نەفعو زەرەرا خوە ئەو نزانت**
**یا قەنج ژ بۆ خوەرا چ زانت ؟**

( خانی ، ل ٤٨٨ )

---

(١٢١) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، سۆکۆلۆڤ ، ل ٦٦ .

(١٢٢) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڕاستۆرگویڤا ، ل ٦٧ .

(١٢٣) بڕوانە :

أ ـ سەرچاوەی ناوبراو ، ذو النور ، ل ٣٣ .

ب ـ سەرچاوەی ناوبراو ، علی برناك ، ل ٣٤ .

(١٢٤) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، فورولۆڤا ، ل ٣٤ .

**... تـو چ ژ من دەخومزی ؟**

**( کوردۆ ، ل ٤٣ )**

**نـابینی کـــو پێـکفه جملـــه زددن ؟**
**حیکمەت چییـــه ، بـوٚچ پێکفــه نـــددن ؟**

**( خانی ، ٢١٤ )**

**چی ل دۆرا وی دبوو و دفەومی گشك فەهمدکر .**

**( کوردۆ ، ل ٤٢ )**

**کام / کامه / کێهه / کێها / کێهان / کیژان / کیشك ..**

ئەم دەستە جێناوە خاوەنی یەك واتان‌و بۆ پرسیاری جوداکردنەوەی کەسێك یان شتێك لەنێو کۆمەڵێکدا بەکاردەهێنرێن .

لـە زمـــانی ئەدەبیی کوردیـــدا فۆرمی ( کام / کامه ) دەبینرێ . ئەم فۆرمەش لە ئاوێســـــتادا لە شێوەی « کەتەمه »[125]و لە فارســـی ناوەڕاستدا « کەتام »[126]و لە فارســـیی نوێدا « کودام »[127] ... دا بەرچاو دەکەوێ .

چەند نموونەیەك :

**کـام بەرزی جوانـــه وەك بـــەرزیی بـــاڵای ؟**
**کـام تیشـــك ئەگاتە تیشـــکی نیو نیگای ؟**

**( گۆران ، ل ١٠ )**

**چۆلەکە هازت کامه ؟ تا بازت کام بێ**

**( پەندی پێشینان ، ل ١٧٦ )**

---

(١٢٥) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، سۆکۆلۆف ، ل ٦٦ .

(١٢٦) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڕاستۆرگویڤا ، ل ٦٨ .

(١٢٧) بڕوانە :

أ ــ سەرچاوەی ناوبراو ، ذو النور ، ل ٣٤ .

ب ــ سەرچاوەی ناوبراو ، علی برناك ، ل ٣٥ .

له بەشـــە دیالێکتی موکریانو ســـــــۆراندا لەپاڵ بەکارهێنانی ( کام / کامە )دا . فۆرمی ( کێهە / کێها / کێهان )[128]یش هەیە :

بـە وێنـە :

**دەبێ لـە خەویـان هەڵبستێنین ، بزانین ، کێهەیان جوانـە ، کێهەیـان قسان چاك دەزانێ .**

( تحفەء مظفریە ، ب ۱ ، ل ۲۲۹ )

فۆرمی ســـــەرەکیی ئەم جێناوە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا « کیژان »ەو لە هەندێ ناوچەی بادینانیدا شـــــــێوەی « کیشك »یش دەبیسترێ .

« کیژان » لە جێناوی پرسیاری « کی ؟ »و پرپێۆزیشنی « ژی »و جێناوی کەسیی « وان »ی دۆخی تیان ســـازبووە[129] ، کـــە واتـــای ( کامە لە وان ) دەبەخشێت .

وێنەی ئەم « کیژان »ە لە دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا لـە شێوەی « کوژان »دا دەبینرێ[130] .

---

(۱۲۸) ئەم جێناوە لە دیالێکتی ڕۆژهەڵاتی زمانی بلووجیدا لە شـــێوەی « کیبان »دا دەبینرێ ( بڕوانە : ســەرچاوەی ناوبراو ، فوروڵۆڤا ، ل ۳٤ ) .

(۱۲۹) بڕوانە :

ا ــ ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەســـتەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆســـکۆ ، ۱۹۷۸ ، ل ۱۱٥ .

ب ــ چ. ح. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆســـــکۆ ، ۱۹۷۳ ، ل ۱٥٥ .

جـ ــ سەرچاوەی ناوبراو ، تسابۆلۆف ، ل ۳۰ .

(۱۳۰) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، فوروڵۆڤا ، ل ۳٤ .

چەند نموونەیەك :

**... ئەز نزانم کیژان ماعر بوو ....**

( کوردۆ ، ل ٣٦ )

**ئەز کەتمە بەختێ تــە ، برا ، هەلــە ژ منرە بێژە ، کا تو بــاوەڕ دبی ب کیژان سووندانە ؟**

( مەمێ ئالان ، ل ٩١ )

**چۆن / چلۆن / کوو / چەوا ( ن ) / چاوا ( ن ) .**

ئەم جێناوانە بۆ پرســــیارکردن لە شـــتو لە چۆنیەتی ڕووداو بەکاردەبرێن .

لە زمانی ئەدەبیی ئەمڕۆی کوردیداو لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی خوارووودا « چۆن » فۆرمی سەرەکییە .

وێنەی ئەم جێناوە لە فارسیی نوێدا « چوون »ە[131]و لە فارســیی ناوەڕاستدا « چێگۆن »ە ( کە لە جێناوی پرسیاری « چێ »و « گۆن » ــ واتە « شێوە . وێنە . ڕەنگ » پێکهاتووە )[132] ...

چەند نموونەیەك :

**چــۆن دێتــەدەر ؟ چــۆن ئــەڕژێ ؟**
**وا گیــان ئەســـمێ ، هۆش ئەمژێ ؟**

( گۆران ، ل ١٠٣ )

**ئێســـتا لــە داخا هیچم بێ ناخــورێ**
**ئەوسن چۆن بەرگەی برسێتی ئەگرێ ؟**

( پیرەمێرد ، ل ١٦٥ )

---

(١٣١) بڕوانە :

ا ــ سەرچاوەی ناوبراو ، ذو النور ، ل ٣٤ .

ب ــ سەرچاوەی ناوبراو ، علی برناك ، ل ٣٥ .

(١٣٢) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو . تسابۆلۆف ، ل ٣٠ .

**بێرو هاوێــری لەگــەڵ کاکی نەکردبــا بێشــــــك**
**چۆن دەمان‌بوو ئەو هەموو گۆشتەو پەنیرو بەرگنە ؟**

( تاریك‌و ڕوون ، ل ٧١ )

له فۆلکلۆرو ئەدەبیاتی کۆن‌و زمانی ئاخـاوتنی ئەمڕۆی ناوچـــەی موکریان[١٣٣]و سۆراندا « چلۆن » فۆرمی ســــــەرەکی‌یە • ئەم فۆرمی « چلۆن »ە لە بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی کۆن‌و بەشێکی کەمی ئەدەبیـاتی ئەمڕۆی ناوچەی سلێمانیشدا دەبینرێ •

بــە وێنــە :

**دەروێش کوتی : « شاە عەبباسێکی لە ئیســــفەهانێ ، ئەمنێکی لێرە ؛ چلۆن بە بەختی وی بچم ؟ » •••**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ١٨٠ )

**« ••• کــاکــە مەمی چلۆن ببەتلێنین ، قەرەتاژدین ، عرفــۆ ، چەکۆ پێ‌نەزانن ؟ » •**

( تحفەی مظفریە ، ب ١ ، ل ٣١٨ )

**وا ظەن مەبە ڕوخســارەیی تــۆ غائیبە قوربــان**
**بنواڕە چلۆن نەقشـــــە لەنێــو دیدەیی تەڕمــا**

( نالی ، ل ١٢١ )

**یــا ئەپرســین ، یــا ئەگریــن ،**
**ئیتـــــر چلــۆن بخـــوێنین ؟**

( گۆران ، ل ١٠٨ )

لە ناوچەی ســــۆران جگە لـــە « چۆن »و « چلۆن » ، **هەروەهــا** « کوو »ش زۆر بەرچاو دەکەوێ • ڕە ئە تــــــۆبۆلۆف لەبارەی ئــەم

---

(١٣٣) کەریمی ئەیوووبی‌و سمیرنۆڤا لە کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری » ( لێنینگراد ١٩٦٨ )دا بــــە هیچ چەشــــــنێك ناوی « چلۆن »یان نەبردووەو بە مەڵە « چۆن »یان بە فۆرمی سەرەکی داناوە •

جێنـــاوەوە نووســـــــــــیوێتی : « ڕەنگە پێـــوەنــدی بە ( کووە ـ Kuwa )ی ئاوێستییەوە هەبێو ( و ـ w ) بووبێ بە ( هـ ـ h )و دواییش سوابێ »[134] •

بــە نموونە :

**لە قرژاریان پرسی کوو بە هەردوو سەران دەڕۆی ؟ گوتی چ لە لاوان بە عەیب ناگیرێ •**

( پەندی کوردی ، ل ٧٤ )

فۆرمی « چەوا( ن ) » / « چاوا( ن ) » سەر بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروووە • وەك :

**پادشا ژ عەلی مەمەد پرس‌کر گۆت : « بێژە ، چاوا بوو ، کو تــە گولە ل قیزا من خست ، بێژە مەعنیا وێ چ بوو ؟ » •**

( کوردۆ ، ل ٤٠ )

**دگۆتن : « ئەمێ چاوا ژ بۆ دەردێ وی ببینن دەرمانە ؟ » •**

( مەمێ ئالان ، ل ١٣١ )

**ل حەســـــەن فەتەڕێ ، گۆتی : « برا ، فێ جــارێ گۆتنــا تــە چاوانــە ؟ » •**

( مەمێ ئالان ، ل ١٢٧ )

**کەی / کەنگێ / کەنگی / کەنگین / کەنگینێ / کەینێ •**

لە ناوچەی ســــلێمانیو هــەنــدێ هەرێمی دی تەنیـــا « کەی » بەکاردێنرێ • لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا « کەنگێ »و « کەنگی » دەوترێ • لە ناوچەی موکریانو سۆراندا جگە لە «کەنگێ»و «کەنگی» ، فۆرمی « کەنگین »و « کەنگینێ »و « کەینێ »یش بەرچاودەکەون •

---

(١٣٤) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، تسابۆلۆف ، ل ٣٠ •

چەند نموونەیەك :

**کەی تۆم دیوە ؟ کەی ئەتناسم ؟ کەی ؟ کەی ؟ کەی ؟**
**دڵــداری چی ؟ پەیمانی چی ؟ حەی ! حەی ! حەی !**

( گۆران ، ل ٢٧ )

**دیلی ، ژێردەستی ، ئەسیری ، تا کەی ؟**
**ڕووتی ، نــەداری ، فەقیری ، تا کەی ؟**

( تاریكو ڕوون ، ل ٥٠ )

**کانە گیان لاوی کوردی شــۆخو شــەنگ**
**تا کەنگێ دەبی وا بێهەســـتو دەنگ ؟**

( تاریكو ڕوون ، ل ٥٠ )

**کــەنگێ ژ مــەرا دبت مویــەســسەر ،**
**خالق ژ ئــەزەل نــەکــەت مقــەددەر ؟**

( خانی ، ل ٤٧٦ )

**بـــە داو دەکــــــەن پێکـــــۆڵێ**
**وەدەرکـــەوت لــە ســـــتەمبووڵێ ،**
**کــەنــگێ وەکـــــەم وێ تـــۆ لێ ؟**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٢١٨ )

**بــە منداڵی پەیوەستی ، بە جاعێری سەربەستی**
**بــە پیری کەی هەڵدەستی ؟**

( پەندی کوردی ، ل ٢٥ )

**کوا / کوانێ ؛ کا / کانێ .**

بۆ پرسیار لە کەسو شت بەکاردێنرێن .

« کوا کوانێ » سەر بە دیالێــکتی خوارووو « کا / کانێ »یش سەر بە دیالێکتی ژووروون :

بـە وێنـە :

ئەی چاو ! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەریّ پەڕت ،
کـوا باڵە تیژەکـانی نیگای حوســــنی دلبەرت ؟
کوانێ دوو چاوی مەســت ؟ کوانێ ؟
کوانێ برۆی پەیوەســــــت ؟ کوانێ
کـوانێ زوڵفی ڕەش ؟
کوڵمی ئـاڵو گەش ؟
کوا هەیکەلی جەمال ؟
کوا حوسنی بێمیثال ؟

( گۆران ، ل ١٣ )

کوانێ ســــــواری دەنازەنین ؟
کێ بوو ؟ لـە ئـالی ئـادەمـان
قـەلاتی هەڵـگرت بـە زەمـان

( تحفهء مظفريه ، ب ١ ، ل ٢١٦ )

وەرە ئێرەو مەپرسە تۆ ئەدی چارشێوو ڕووبەند کوان ؟
وەرە ئێرە ببینە چاوی مەســــتو بەژنو بـالای جوان

( تاریك‌و ڕوون ، ل ٦١ )

کـاڵ بۆوە پـەنجـەی جوانـان
کـوانێ گەمـەی جێ ژوانـان ؟

( تاریك‌و ڕوون ، ل ٩٥ )

... کـا ڤاربۆخا تە ؟ ئەز وێ نابینم ...

( کوردۆ ، ل ٩٢ )

کـا ئـەو چاوا چێکرنـە ؟

( جیم‌و گولپەری ، ل ١٦ )

کـانێ ل مـە ئاشـــــە ، یانە زیزە ؟
بـاخی وی بوهـارە ، یـا پەییــزە ؟

( خانی ، ل ٣٤٨ )

فۆرمی « کا » له ناوچەی سۆرانیش بەکاردێ •

بـە وێنـە :

**نەڵێی کـا ماڵت ؟ ناڵێم کـا قەبرت**

( پەدی کوردی ، ل ٨٥ )

**کوێ / کێ / کێندەر / کوێندەرێ / کیرێ / کیدەرێ / کوێدەرێ / کوو •**

بۆ پرسیاری شوێنو جێگە بەکاردێن •

له ناوچەی سـلێمانیو موکریانو هەندێ هەرێمی تری دیالێکتی خوارووی کوردیدا تەنیا فۆرمی ( کوێ ) دەبینرێ • له ناوچەی هەولێرو کۆیەو ناو شوان فۆرمی ( کێ / کێندەر / کوێندەرێ )[١٣٥] بـاوە ••• فۆرمی « کیرێ کیدەرێ / کوێدەرێ / کوو » له ناوچە جیاوازەکـانی دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێن •

چەند نموونەیەك بۆ وێنەی کرمانجیی خواروو :

**••• پەح ئەمـە چی بوو من دیـم ، من لـە کوێم ، ئەمە خەوە یـان نـا ؟**

( له خەوما ، ل ٥٧ )

**لەنـاو کورددا نەبوو پەیمان شـکاندن**
**له کوێ فێربووی گوڵـم پەیمانشـکێنی ؟**

( تاریكو ڕوون ، ل ١٢٩ )

**دەوڵەمەند پیرۆزت بی ، فەقیر له کێت بوو ؟**

( پەندی کوردی ، ل ٤٦ )

**شێتان شێتەبن دەچنە سـەر ئۆمەرمەندان ، ئۆمەرمەندان شێت بێ بچنە کێندەر ؟**

( پەندی کوردی ، ل ٦٠ )

---

(١٣٥) له شێوەی سلێمانیدا ، ئەو فۆرمە ناوەناوە لـە هەنـدێ بـاردا دەبینرێ ، وەك ئەوەی دەوترێ : « فلاّنە کەس کوێندەری »یە •

چەند نموونەیەك بۆ وێنەی کرمانجیی ژووروو :

**... تە ئەو ژ کیدەرێ ئانیەیە ؟**

( کوردۆ ، ل ٨٣ )

**... ئەڤ ڕێ دچن کوو(١٣٦) ؟**

( کوردۆ ، ل ٩٦ )

**... پرسی : « تو کیبی ؟ کوو هاتی هەواریا من ؟**

( کوردۆ ، ل ٦٥ )

**... گۆت : « هەڤالۆ خوەندەگەها کەچان ل کوویە ؟**

( جیمو گولپەری ، ل ٦ )

**چەند / چەن / چەنگ ..**

ئەم جێناوە بۆ پرسیاری ئەندازەو ژمارە ... بەکاردێ • ( چەنـد ) لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وەك جێناوی پرسیارو جێنـاوی چەندێتی دەبینرێ •

وێنەی ئەم جێناوە لە ئاوێستادا « چڤەتت »(١٣٧) ؛ لە فارسیی کۆندا « چیەنت »(١٣٨) . لە فارسیی ناوەڕاستدا « چەند »ە(١٣٩) •

لە بەشە دیالێکتی سـلێمانیدا شێوەی « چەن »و « چەنگ »یش بەرچاودەکەوێ •

---

(١٣٦) فۆرمی « کوو » لە شێوەی لوڕیشدا بەکاردێ .

(137) A.V. Williams Jackson. Avesta Grammar. Part I. Stuttgart W. Kohlhammer. 1892. P. 144.

(١٣٨) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو . تـابۆلۆڤ ، ل ٣٠ .

(١٣٩) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڕاستۆرگویڤا ، ل ٦٨ .

نموونــه

**هنــدی ئــەوی ڕاکــرن ســـــــەلاطین**
**دەهـ چەند ئەوی چێکرن شـــەیاطین ؟**

**( خانی ، ل ۲۱۸ )**

**پێم بڵێ توخـوا چەنــد جـوانت دی ؟**
**چەند جووتەیــاری دەس لــە ملانتدی ؟**

**( بێکەس ، ل ۱۵۲ )**

**خوێنی کوڵمی چــەن گــەش بوو ؟**
**چــاوو برۆی چــەن ڕەش بــوو ؟**

**( گۆران ، ل ۸۹ )**

تایبەتێتییەکی دیاری جێناوی پرسیار لە زمــانی کوردیــدا ئەوەیــە ، زوربەیان لە جێناوەوە دەتوانن ببن بە بەشە ئاخاوتنیتر ، یاخود لە جێناوی پرسیارەوە ببنە گروپێکی دی جێناو •

بە وێنە لە ڕســـــــتەی وەك : « چۆن بە باش دەزانی ، وابکە » ؛ « چۆن هێنات . وەها ببیەرەوە » ••• دا « چۆن » بووە بــە ئامـــرازی پێوەندی ( عطف )و دوو ڕســتەی بەیەکەوە بەســتۆتەوە بێ ئەوەی هیچ پرسی تێدابێ ••• وشەی « کەی » لە ڕستەی وەك : « کەی زستان هات ، بەفریش دەبارێ » ؛ « کەی شێرکۆ هاتەوە ، بەپیریەوە دەچین » ••• دا ، کە دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، ئەو واتایە بەدەستەوە نادات کــە لەباری پرسیاردا بەدەستیەوە دەدات ، چونکە لێرەدا پرسیار نییە ـ واتــە لێرەدا ( کەی ) جێنــاوی پرســـــیار نییە ، بەڵکو ئامرازی پێوەندی ( عطف )ە •

لە سەرەوە لەوە دواین کە ( چ ) جێناوی پرسیارەو بۆ پرســــیار لە شتو هۆی ڕووداو بەکاردێنرێ ، بەڵام کاتێ بە واتای ( هیچ ) دێت ، ئەوە دەبێتە جێناوی نەفی • بە وێنە :

**بەکر ئاغا کوتی : « قوربان ئەمن چ نادەم » .**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٣١٨ )

**ئەتوو هێشتا شکلی نحۆیێ گەرگەری چ جارەکی بە چاوێ سەرێ خو ڕا نەدیتیە .**

( فۆلکلۆر ، ل ٢١٠ )

یاخود وشەی ( چەند ) کاتێ بۆ پرسیاری ئەندازەو ژمارە بەکاردێنرێ جێناوی پرسیارە ، بەڵام دەمێ پرسیاری پێ ناکرێ دەبێتە جێناوی چەندێتی ، وەك :

**... زۆر هیلاکو ماندوو بووم ، لەپاش چەند سەعاتێك هێز لە ئەژنـۆم بڕا ...**

( لە خەوما ، ل ٢٩ )

**گۆت : « چەند رۆژا شووندا ئەزێ ژ تەڕا بێژم » .**

( کوردۆ ، ل ٤٥ )

**... هتد .**

جێناوی پرسیاریش ، هەروەك جێناوی خۆیی ، جێناوی لکاو وەردەگرێ :

١ ـ جێناوێکی دەستەی یەکەمی دەچێتە سەر ، وەك :

چی + م ←←←← چیم

**من ئومێدی چیم هەبوو ، کەچی چیم دیو چیم بیست .**

( لە خەوما ، ل ٥٣ )

چی + مان ←←←← چیمان

**بۆچی زاین ؟ کەی ، چۆن ئەمرین ؟**
**چیمان لێ دێ کە مردین ؟**

( گۆران ، ل ١٠٧ )

کام + ی ⟵ کامی

**ئێمە مایەی چوار سروشتین : ئاوو ئاگر ، خاکو بـا**
**ئـەم هەوێنـە کامی زیاتربێ ، بـەلای ئەویـا ئەبـا**

( پیرەمێرد ، ل ۲۹۰ )

۲ ـ یەك جێناوی دەستەی دووەم وەردەگرێ ، وەك :

کێ + ن ⟵ کێن

**... وتیان مەڕۆن بزانین ئێوە کێن ... ؟**

( لە خەوما ، ل ۳۲ )

کوێ + م ⟵ کوێم

**پەح ئەمە چی بوو من دیم ، من لە کوێم ، ئەمە خەوە یان نا ؟**

( لە خەوما ، ل ٥٧ )

۳ ـ دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە دەلکێ ، وەك :
کێتانمان . چیتانمان ...

٤ ـ جێناوێکی دەستەی یەکەمو بە دوایدا هی دووەم ، وەك :
چیمانن . چیتن ...

٥ ـ کاتێ جێناوی پرسیار جێناوی لکاوی دەچێتە سەر چ لـە پێشو چ لـە پـاش جێناوەکەوە مۆرفێمی ( ش / یش ) دەتـوانێ وەربگرێ ، وەك :

أ ـ لە پێش جێناوەکەوە :

کێشم ، کێشـتان ... چیشـم ، چیشـتان ...
کامیشم ، کامیشتان ... چەندیشم ، چەندیشتان ...

ب ـ لـە پاش جێناوەکەوە :

کێتانیش ، چیتانیش ...

# جێناوی چەندێتی

لە مەسەلەی جێناوی چەندێتی‌دا سێ شتی سەرەکی لە باسە ڕێزمانییەکاندا بەدی دەکرێ :

١ ـ زوربەی نووسەران نە باسیان کردووەو نە بەلایدا چوون[١٤٠]. دیارە ئەمەش لە دوو ڕێگەوە وا کەوتۆتەوە : یەکەم ـ بەشێك لەوە نووسەرانە لەبەر کورتیی نووسینەکانیان یان هەست‌پێنەکردنی بەلایدا نەچوون ؛ دووەم ـ بەشێکی تریان لەبەر ئەوەی بە جێناویان دانەناوە یان ئەگەر بە جێناویشیان دانابێ ، وەك جێناوی چەندێتی تەماشایان نەکردووە .

٢ ـ کەمێ لە نووسەران ، ئەگەرچی باسیان کردووە ، بەڵام وایان داناوە ، کە ئەم گروپە جێناو نییەو پێوەندی بە ناوو ئاوەڵکردارەوە هەیە[١٤١] .

٣ ـ ئەو نووسەرانەش کە وەك گرووپێکی تایبەتی جیایان‌کردووەتەوەو لێی‌دواون . زوربەی زۆریان بە چەند دێرێك کۆتاییان بەو باسە هێناوە ... وێڕای ئەوە ئەوانەش کە لەم باسەدا سەرکەوتوون گەلێ وشەی ئاشکرای ئەم گروپەیان ناونەبردووە[١٤٢] .

---

(١٤٠) بە نموونە ، وەك : سەعید صدقی ، تۆفیق وەهبی ، نووری عەلی ئەمین . لیژنەی زمان‌و زانستەکانی کۆڕ ، د. مەکسیمی خەمۆ ... هتد .

(١٤١) بەوێنە ، وەك : تسۆلۆف . ل ٣١ ... هتد .

(١٤٢) بەوێنە د. قەناتی کوردۆ لەوانی کرمانجیی خوارووودا ناوی ( چەندە ، چەندی ، ئەوەندە . ئەوەندی ، ئەمەند ، ئەمەندە ، ئەمەندی ...)ی نەبردووە . لەوانی کرمانجیی ژووروویشدا ( هندەك ، ئەڤقاس )ی ←

له زمانی کوردیدا کۆمەڵێ وشە هەن ، کە بۆ مەبەستی گەیاندنی مانای چەندێتی بەکاردێن‌و دەکرێ بە ( جێناوی چەندێتی ) ناوببرێن • وەك :

لە کرمانجیی خوارووداا

١ ـ چەند / چەندە / چەندی

٢ ـ ئەوەند / ئەوەندە / ئەوەندەی

٣ ـ ئەمەند / ئەمەندە(١٤٣)

٤ ـ هێند / هێندە / هەند / هەندە

نموونە :

چەند

چاوەکەم ! مەڕوانە ڕەنگی ظاهیری
خۆ دەزانی ( ڕووسپی ) چەند ڕووسپییان

( نالی ، ل ٣٢٦ )

کراسی یاری چەند تەنکە
تێدا دیارە زەرد مەمکە

( فۆلکلۆر ، ل ٧٠ )

---

یادداشت نەکردووە ( ل ١٥٩ ــ ١٦٠ ) ... د. چەرکەزی بەکۆ ناوی ( هنەك ، هندەك )ی نەبردووە ( ل ١٥٧ ــ ١٥٨ ) ... د. کەریمی ئەیووبی‌و ئی. ئا. سمیرنۆڤا تەنیا ( چەند ، هێندە ، ئەوەندە )یان تۆمارکردووە ( ل ٤٩ ) ... د. کوردستان موکریانی بۆ ئەوانەی کرمانجیی خواروو تەنیا ( چەند ، ئەوەندە ، هێندە )ی نووسیوە . بۆ ئەوانەی کرمانجیی هەر ( چەند ، چقاس ، ئەڤقاس ، ئەوقاس )ی یادداشتکردووە ( ل ٢٤٧ ــ ٢٤٨ ) ...

(١٤٣) وشەکانی ( چەند ... ئەوەندە ... ئەمەندە ... ) لە ئاخاوتنی سلێمانیدا لە شێوەی ( چەن ، چەنگ ... ئەوەنە ، ئەوەنگە ... ئەمەنە ، ئەمەنگە ... )دا دەبینرێن .

چەنـدە

چەندە خۆشــە دابنیشین دوو بە دوو ئەمن‌و گوڵــم
داکەوێتن موددەعی لــەو خوارە هەروەك دەستی کەر

( نالی ، ل ۲۰۳ )

چەندی

چۆمێ باراندێزی دێتە خوارێ ، چەندی زوڵاڵ‌و شیرینە !

( تحفهء مظفریه ، ب ۱ ، ل ۲۰۳ )

ئەوەند

ئەوەند شــیرینە بــە قوزەڵقورتەوە ئەخورێ

( پەندی پێشینان ، ل ٦۰ )

ئەوەندە

ئەوەندە بــە شوێن دزا بچۆ ، لێت هەڵنەگەرێتەوە

( پەندی پێشینان ، ل ٦۰ )

ئەوەندەی

ئەوەندەی قنگە جنۆکەیەکە

( پەندی پێشینان ، ل ٦۱ )

هێند

دڵ موشەببەك بوو لەبەر ئێشان‌و نیشــــانی موژەت
ئیشی چاو بو بۆیە هێند گریا‌و خوێنی کەوتەســەر

( نالی ، ل ۲۰۲ )

هێندە

تیری موژگــانت لــە ســینەمدا دەچێ بــۆ پیری دڵ
هێندە کــە چ ئایینە قەصــــدی خانەدانی دین دەکا

( نالی ، ل ۱۱۳ )

**هەند**

**کوڵکە مەلا هەند زۆرن**
**حیلەو شەرعیان دانایە**

**( فۆلکلۆر ، ل ٢٣٥ )**

**هەندە**

**چەند ئەستێرەی لە عاسمانێ**
**هەندەم خەنجەر دادەڕژانێ**

**( فۆلکلۆر ، ل ٧٢ )**

**تێبینی :**

بە سەرنجڕاگرتن لە جێناوەکانی چەندێتی دیالێکتی خوارووی کوردی ئەوە بەدیدەکرێ کە :

١ ـ تێکڕایان کۆتاییان بە ( ند / ەندە ) هاتووە .

٢ ـ بەشێکیان نیشانەی ( ێك ، ێ ، ەك )ی نەناسیاوی وەردەگرنو گەلێ جار لەگەڵ ئەو نیشانانەدا بەکاردێنرێن . وەك : چەندەك ، هێندێ ، هێندێك ، هەندەك [١٤٤] ...

٣ ـ گشتیان جێناوی لکاو وەردەگرن . وەك : چەندم ، ئەوەندەمان ، ئەمەندەت ، هێندەیان ...

لە کرمانجیی ژووروودا

چەند

هنەك / هندەك ـ ( هێندێ ، هێندێك )

چقاس ـ ( چەندێك )

---

(١٤٤) ئەو وشانە کاتێ نیشانەی نەناسیاوی وەردەگرن پتر وەك جێناوی نادیار بەکاردێن .

ئەڤقاس ـ ( ئەمەندە )
ئەوقاس ـ ( ئەوەندە )

نموونـه :

چەنـد

یـەك بوو ئەلیف یـەك نوقطه کـر
چەنـد شـکلێ دی لێ زێـدە کـر

( جزیری ، ل ٥٣ )

هنەك / هندەك(١٤٥)

هنەك دبێژن : « ئەمێ ناڤێ وی بکن عارف » . هنـەك دبێژن : « ناوەلاهـ ئەمێ بکن عەمەر » ...

( مەمێ ئالان ، ل ٤١ )

... هندەك چوون ...

( کوردۆ ، ل ٥٤ )

چقاس ... ئەوقاس

بـاڤـۆ چقـاس سـتەیرن ل عەزمانـا ،
چقـاس خیـزێ بـەر دەڤێ بحـارا ،
ئەوقـاس خێڤـەت ل دۆر مەگرتنـە .

( کوردۆ ، ل ٢٠٦ )

تێبینی :

سێ جێناوی ( چقاس ، ئەڤقاس ، ئەوقاس ) لێکدراونو لە ( چ ) و ( ئەڤ )و ( ئەو ) لەگەڵ ( قاس ) سازبوون . ( قاس )یش لە ( قاسی )یەوە وەرگیراوە ، کە ، اتای ( بەرانبەر ، هێندە ... ) دەگەیەنێ .

(١٤٥) ( هنەك / هندەك ) لە هەندێ باردا وەك جێنـاوی نادیاریش خۆی دەنوێنێ .

# جێناوی هەیی

دەربارەی کێشەی جێناوی هەیی لە زمانی کوردیدا ئـەوە بەرچـاو دەکەوی کە بەشێك لە نووسەران تەنیا باسی ( هی )یان کردووە[١٤٦] ... تێکڕای ئەو زانایانەی لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بەدوا ئەم کێشەیە کەوتوون ، نیشانەکانی ئیزافەشیان بە جێناوی هەیی لەقەڵەم داوە[١٤٧]...

وەك لێکۆڵینەوە دەری‌دەخا ، لـــە زمانی کوردیـدا وێڕای ( هی ) هەندێ فۆرمی تری جێناوی هەیی هـەیـە ... هـەرچی نیشـــــانەکانی ئیزافەشە، ئەگەرچی ڕاستە لە ڕەسەندا لەجێناوی هەیی‌یەوە کەوتوونەتەوە ، بەڵام بوون بە نیشانەی ئیزافەو لە جێناوی شۆڕاون .

جێناوی هەیی ئەو جێناوەیە کە خۆیەتی ( تملك ) ڕادەگەیەنێ .

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ( ئی ) جێناوی هەیی بووەو هەروەهـا کاری ئیزافەشی بەجێ‌هێناوە ـ واتە یاریدەی دانەپاڵ‌یەکتری دیـارخـەرو دیارخراوی داوە[١٤٨] .

---

(١٤٦) بەوێنە ، وەك : تۆفیق وەهبی ( ل ١١٣ ــ ١١٤ ) ؛ نووری عەلی ئەمین ( ل ١٠٦ ـ ١٠٧ ) ...

(١٤٧) بـــە نموو ـــە ، وەك : د. قـەنـاتی کـوردۆ ( ل ١١٦ ـ ١١٧ ) ؛ د. چەرکەزی بەکۆ ( ل ١٥٠ ــ ١٥٧ ) ؛ صـــــادق بەهـــائەدین ( ل ٩٦ ــ ٩٧ ) ؛ د. کوردستان موکریانی ( ل ٢٤٨ ــ ٢٤٩ ) ...

(١٤٨) بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاســـــت ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٧٣ ــ ٧٤ .

... جێناوی هەیی کە لە ئاوێستادا ( یە / یا ) ، ( یەت / هیەت ) بووە لە هەمان کاتدا وەك نیشانەی پێکەوەبەستنی دیارخــەرو دیارخــراو خۆی نواندووە[149] .

وێڕای تایبەتێتی هەندێ بەشە دیالێکت ، ئەوە دەمێنێتەوە کـــە لـە دیالێکتی خواروی کوردیدا ( هی / ئی ) فۆرمی ســــەرەکیی جێناوی هەیی‌یە .

هەرچەندە وشەی ( هی / ئی ) لە تێکستی کۆنو نوێی کوردیدا بە شێوەیەکی سەرەکی وەك جێناوی هەیی بەرچاو دەکەوێ ، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا دەبینرێ کە دیارخەرو دیارخراوی پێکەوە بەستووە ـ واتە دەوری ئیزافەی بینیوە .

لە ئاخاوتنو نووسینی زوو و ئەمڕۆی سلێمانیدا فۆرمی زۆر باوی ئەو جێناوە ( هی )یە .

بـە وێنە :

دوو شـــــــتە ڕێگەی ڕزگاری من بێ
یـــا یار هیی من بێ ، یـــا یـــار هێمن بێ
( پیرەمێرد ، ل ١٦٥ )

ئەی ئەندام وردیلەی ، نەرمۆلەی ، ئێسك ســووك ،
ئەی بەرگی ســـــاکارت دڵگیرتر لـــە هیی بووك !
( گۆران ، ل ٤٥ )

هیی خۆم بۆ خۆم ، هیی تــۆ ئەخۆم .
( پەندی پێشینان ، ل ٤٩٩ )

---

(١٤٩) بڕوانە : سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێــــــستا ، مۆســـــکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٦٥ ــ ٦٦ .

له ناوچەکانی موکریانو سۆران ئەگەرچی دیسان هەر فۆرمی ( هی ) باوە ، بەلام فۆرمی ( ئی )یش زۆر بەرچاو دەکەوێ ... لە هەندێ شوێنیش فۆرمی ( هین ) بەکاردێنرێ ، وەك کە دەوترێ : ئەو خانووە هین(١٥٠) تۆیە .

جێناوی هەیی لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا بەپێی جنس دەگۆڕرێ : ( یێ – yé ) بۆ نێرو ( یا – ya ) بۆ مێ بەکاردێنرێ .

وەك :

**مالو دەولەتا عەلی مەمەد پر بوو ، پەزو دەوارێ وی ژ یێ جینارا پرتر بوو .**

( کوردۆ ، ل ٣٣ )

**تە ستیا چاف بەلەك بر ، زین ژی یا مەیە ...**

( مەمێ ئالان ، ل ٦٨ )

تایبەتێتی ئەم جێناوە لەوەدایە ناتوانێ وەك ( جێناوی خۆیی ) و ( جێناوی نیشانە ) ... جێناوی لکاو یان مۆرفێمی ( ش / یش ) ... وەربگرێ .

---

(١٥٠) ئەم جێناوە لەگەڵ وشەی ( هین ) کە بە واتای ( فلان ، وانەك ، هەرامە .. ) دێت ، جیاوازە . وەك :

دوێنێ هینم بینی
لە بازاڕ هین دەفرۆشن

# جێناوی نەفی

لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا بە شێوەیەکی سەرەکی ( هیچ ، چ ) وەك جێناوی نەفی بەکاردێن‌و زۆر جاریش وشـــەی ( کەس / کەسێ / کەسێك ، شت   شتێ / شتێك ، یەك / یەکێ / یەکێك )یان لەگەڵ دێ .

نموونـە :

لـەڕێی ژیـانـا هیچ پێش نەکـەوتووم
لاتو پەژموردەم ، هـەرموکـو مـردووم
( بێکەس ، ل ٧٥ )

بەکر ئاغا گوتی : « قوربان ئەمن چ نادەم »
( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٣١٨ )

هیچ‌کەس ناتوانێ تـا ڕۆژ بنـاڵێ
مەگـەر عاشـــقی سەودایی خاڵێ
( پیرەمێرد ، ل ٢٠٢ )

وا گلۆلـەی کەوتـە لێژی بـاوی ئیستیعمار نەمـا
هیچ‌کەسێ ئیتر بـە زوڕنـاو تەپڵی ئـەو هەڵناپەڕێ
( بێکەس ، ل ٨٣ )

... هتد .

هەرچەندە ە دیالێکتی کرمانجیی ژووروووشـــدا ( هیچ ، چ ) وەك جێناوی نەفی دەبیـنرێن . بەڵام وشەکانی ( تو ـ قەت ) کە بە مانای ( هیچ ) دێن ، زۆرتر لە کردان .

نموونـە :

عەلی مەمەد گوت : « ئیرۆ تـو نێچیر ڕاستی من نەهات ... » .
( کوردۆ ، ل ٣٧ )

... ئەز نکارم تــو نافا ل کورێ خوە بکم

( مەمێ ئالان ، ل ٤١ )

... لێ قەت نێچیر ڕاستی وی نەهاتن

( کوردۆ ، ل ٣٤ )

لەگەڵ ( تو ، قەت )یشدا ، زۆر جار وشەی ( کەس / کەســـەك ، تشت / تشتەك ... ) دێت . وەك :

... قــەت کەســـەك پێ نەحەسیا

( کوردۆ ، ل ٣٦ )

جێناوی نەفیش جێناوی لکاوو مۆرفێمی ( ش / یش ) وەردەگرێ . وەك : هیچم ، هیچت ، هیچمان ، هیچتان ... هیچیشیان ...

ئێســـــتا لــە داخا هیچم پێ ناخورێ

نەوســــن چۆن بەرگەی برسێتی ئەگرێ

( پیرەمێرد ، ل ١٦٥ )

هیچت نەبێ‌و ڕاخــەرت بێ

( پەندی پێشـینان ، ل ٤٩٩ )

... هتد(١٥١) .

---

(١٥١) زوربەی زۆری نووســــــەرانی ڕێزمانی کوردی باســـی ئەم جۆرە جێناوەیان نەکردووە . شایانی باسە ، هەندێ لــە نووســــــەرانی قوتابخانەی سۆڤێت لێی‌دواون ، بەتایبەتی : د. قەنـــاتی کــــوردۆ ( ١١٩ ) ؛ د. جەرکـــەزی بەکـــۆ ( ل ١٦٢ ــ ١٦٣ ) ؛ د. کەریمی ئەیووبی‌و د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ( ل ٥٠ ) ؛ د. کوردستان موکریانی ( ل ٢٥٢ ــ ٢٥٣ ) .

# جێناوی هاوبەشی

لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا وشەی ( یەکتر ) جێناوی هاوبەشی هەرە دیارو چالاکە • ئەم جێناوە لە ژمارەی ( یەك )و ئاوەڵناوی ( تر ) سازبووە •

**باسکالا بۆ یەکتر**
**لەگەڵ ئاخی ساردو سر ،**
**دوورو درێژ هەڵرێژین :**
**مەیتی بێکەس ئەنێژین !**

( گۆران ، ل ٨٤ )

هەندێ جار ( ی ) دەچێتە سەر جێناوی ( یەکتر ) ، وەك :

**چەند خۆشە دەستەیەك دڵسۆزو یاران**
**رەفیقی یەکتری بێ غەرەزکاران**

( بێکەس ، ل ١٥٧ )

لە هەندێ ناوچەی کرمانجیی خوارووودا هەروەها وشەی ( یەکدی )و ( یەکدوو )ش وەك جێناوی هاوبەش بەدی دەکرێن • ئەم دوو فۆرمەش دیسان لە ژمارەی ( یەك )و ئاوەڵناوی ( دی ، دوو ) ـ کە لە ( دن )ەوە کەوتوونەتەوە ـ پێکهاتوون(١٥٢) •

**دەستیان دەستۆی یەك دەکرد ، دمیان بە دمی یەکدی دەنانە •**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ٢٣٩ )

---

(١٥٢) شایانی باسە د. ئەناتی کوردۆ لەو پێکهاتنە دواوە ، سەرچاوەی ناوبراو ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، ل ١١٤ •

لە دیالێکتی ژووروویی کوردیدا دوو فۆرمی ( هەڤ )و ( هەڤدو ) باون • وەك :

**عەلی بەگ ، عەمەر بەگو ئەلماز بەگی دەرکەتنە هافینگەهانە •**
**ژ خومرە ل هەڤ نێرینو گریانە ،**

( مەمێ ئالان ، ل ٣٩ )

ئەم جێنـــاوەش دەتوانێ جێنـــاوی لکاوو مۆرفێمی ( ش / یش ) وەربگرێ • بەوێنە :

یەکترمـان ، یەکترتـان •••

یەکتریشمان ، یەکتریشتان •••

••• هتد[١٥٣] •

---

**(١٥٣)** نووسەرانی لای خۆمان ( تەنانەت د. کوردستانیش ) باسی ئەم جۆرە جێناوانەیان نەکردووە . زانایانی یەکێتی ســـــۆڤێت لێی دواون : د. قەناتی کوردۆ ، جگە لـــە ( یەکدی ) ، باسی هەموو ئەوانی تری کردووەو باسی لێیاندواوە ( ل ١١٤ – ١١٥ ) . د. چەرکەزی بەکـۆ باسی هەموو ئەوانەی کردووە کە لە زمانی کوردەکانی ســـــۆڤێتدا بەکاردێن ( ل ١٦٤ – ١٦٥ ). د. کەریمی ئەیووبیو ئی. ئا. سمیرنۆڤا تەنیا لە ( یەکتر / یەکتری ) دواون ( ل ٥٣ )و ناوی ( یەکدی )یـان نەبردووە ، کـــە لـــە بەشە دیالێکتی موکریـدا زۆر باوە . ڕ. ل. تسابۆلۆڤ بـــە دوو دێڕێك تەنیا ( هـــەڤ )ی باسکردووەو ناوی ئەوانیدی نەبردووە •••

# جێناوی دیارو جێناوی نــادیار

لــه چاوگێڕان بەو کارانەدا ، کــه لەبارەی ڕێزمانی کوردییـــەوە نووسراون لە باسی جێناوی دیارو جێناوی نادیاردا بۆچوونی هەمەچەشـن دەبینرێ :

١ ـ بەشێك لــه نووسەران دوو گرووپی جێناوی دیــارو جێناوی نادیاریان جیاکردۆتەوەو بۆ هەر گرووپێك کۆمەڵێ وشەیان دیاری کردووە •

بــەوێنــه :

أ ـ بۆ جێناوی دیار :

د• قەناتی کوردۆ وشـــەکانی : « هــەر ، هــەریەك ، هــەرکەس ، هەرتشت / هەرشت . گشك / گشت ، هەموو ، تەڤ ، تەمام / تەواو »ی یادداشتکردووە ( ل ١١٧ ـ ١١٨ ) • د• کەریمی ئەیووبیو د• ئی• ئــا• سمیرنۆڤا وشەکانی هەر ، هەریەك ، هەرکەس( ێك ) ، هەموو ، تەواو ، هەمووکەس ، هەرکامێك ، هەمووشتێك ، سەروو ، هەو »یان ڕیزکردووە ( ل ٥٠ ـ ٥١ )• د• کوردستان موکریانی وشەکانی « هــەر ، هەرکەس ، هەرشت ، گشـــت . هەموو ، هەمووشـــت ، هەمووکەس » و « هەر ، هەرتشت ، هەرکەس گشت/گشك ، هەمی ، هەمیتشت ، هەمیکەس »ی تۆمارکردووە ( ل ٢٥١ ) •••

ب ـ بۆ جێناوی نادیار :

قەناتی کوردۆ وشەکانی « کەس ، تشت ، شتێك »ی تۆمارکردووەو وتوویشیەتی لەگەڵ ئەو وشانە نیشانەی ( ێك ، ێ )یش دێت ( ل ١١٩ ) • د• کەریمی ئەیووبیو د• ئی• ئا• ســـمیرنۆڤا وشـــەکانی : « یەکێك ،

کەسێك ، شەخسێك ، چ کەس ، فلاْنکەس ، شـــتێك ، فلاْنشـــت ، هێندێك ، هێندێ ، کەسێك »یان ناوبردووە ( ل ٥٠ )• د• کوردســـتان موکریانی وشەکانی « یەکێك ، کەســـێك ، هێندێك ، گەلێك ، شـتێك ، فلاْنکەس ، فلاْنشت »ی بۆ دیالێکتی کرمانجیی خواروو نووســـیوەو وشەکانی : « کەس / کەسەك / توکەس ، تشت / تشـتەك / توتشـت ، هنەك / هندەك »یشی بۆ دیالێکتی کرمانجیی ژووروو داناوە ( ل ٢٥٠ ) •

٢ ــ هەندێ لە نووسەران تەنیـــا یەك گروپیـــان دیاریکردووە ، ئەویش گروپی جێناوی نادیارە •

بـــە وێنـــە :

مامۆستا تۆفیق وەهبی وشەکانی : « کەس ، پیاو ، هیچ ، یەك ، کێ ، هین ، کەم ، کام ، چی ، کابرا ، فلاْن ، هەموو ، زۆر »ی بە جێناوی نادیاری سادە داناوەو وشەکانی : « کەســـێ ، هیچکەس ، هەرکەسێ ، هەچکەسێ ، هەموکەسێ ، پیاوێ ، نەختێ ، هێنێ ، هینەکە ، کابراکە ، هەرکابرایی ، هەندێ ، گەلێ ، فلاْنەکەس »یشی بـــە جێنـــاوی نادیاری ناسادە لەقەڵەم داوە ( ل ١٠٩ ) • مامۆستا نووری عەلی ئەمین وشەکانی : « یەکێ ، کەس ، فلاْن ، فیســـار ، کابرا ، هەموو ، هەندێ/تۆزێ/برێ/ کەمێ / پێچێ چۆرێ ، هیچ ، گەلێ ، فرە ، هین / هینـــەکـــە ، وانەك / وانەکەکە ، هەرامە / هەرامەکە / یارۆ / یارۆکـــە »ی بـــۆ جێناوی ناوبراو دەست‌نیشان کردووە ( ل ١٠٤ ــ ١٠٥ ) • مامۆستا جگەرخوێن وشەکانی : « کەس ، هن ، گش ، تەڤ ، هەموو ، پڕ ، کێم ، پیچ ، جۆرگۆر ، زۆر ، گلك ، هیچ »و « ئەوك ، چیك ، ایقـــەر ، یارێ گۆنێ ، فلان ، هرام ، وانەك ، فسار ، کابرا ، یارۆهێن »ی نووسیوە ( ل ٨٤ ــ ٨٥ )•••

٣ ــ چەند نووسەرێکیش ئەو چەشنە وشانەیان بە ئامرازی نادیـــار دانـــاوە •

بـه نموونـه :

مامۆستا سەعید صدقی لە ژێر سـەرناوی ( أدوات مبهمه )دا لـە وشەکانی ( کەس ، هیتر ، هێندێ ، هین ) دواوە ( ل ٥٢ ـ ٥٣ ) ...

لە لێکدانەوەو بەرانبەر یەکتر ڕاگرتنی ئەو نووسینانەدا ، نەك هـەر کێشەی ئەوە دێتە پێش‌چاو کە هەندێ ، ئەو جۆرە وشـانە بە ئـامراز دادەنێن‌و بەشێك بە جێناوی نادیار لە قەڵەمیان دەدەن‌و ژمارەیەکیش بـە جێناوی دیارو نادیاریان ناودەبەن ، بەڵکو گەلێ کێشـەی تریش بەدی دەکرێ :

١ ـ ئەوانەی جێناوی دیارو نادیاریان دیاری‌کردووە ، نەك تەنیـا جیاوازی لە دەست‌نیشان‌کردنی وشەکانی هـەر گرووپێکدا هەیـە لـە نێوانیاندا ، بەڵکو زۆر جار نووسەرێك وشەیەکی لە ڕیزی جێناوی دیاردا تۆمارکردووە . کەچی نووسەرێکی دی هەمان وشەی خستووەتە گرووپی جێناوی نادیارەوە .

٢ ـ لەنێو وشەکانی ئەو نووسەرانەدا کـە تەنیـا گرووپی نادیاریان دەست‌نیشان‌کردووە . هەندێ وشە هەیە کە ماناو مەبەستی دیارو ڕوون‌و ئاشـکرایە .

٣ ـ چ ئەوانەی ئەو وشـانەیان وەك جێنـاوی دیـارو نـادیـار تەماشاکردووەو چ ئەوانەی تەنیا گرووپی جێناوی نـادیـاریان دانـاوەو چ ئەوانەی بە ئامرازی نادیاریان لەقەڵەم داوە . گەلێ وشـەی ئەوتۆیـان تۆمارکردووە ، کە بێ سێ‌و دوو نە جێناوی دیارن‌و نە جێنـاوی نادیارن‌و نە ئامرازی نادیارن . بەوێنە هیچ گومان لەوەدا نییە . کـە وشـەکانی : پیاو ، فرە ، زۆر ، پڕ ، کێم ... و گەلێکی‌دی نەك هـەر جێناوی دیار یان جێناوی نادیـار نین ، بەڵکو هیچ چەشـنە جێنـاوێك نین ...

وشەکانی : کێ . کام ، چی ... ئەگەرچی جێناون ، بەڵام ڕاست نییە بە دیاریو نادیارییەوە ببەسترێنەوە ...

٤ ـ ڕاستە بەشێك لەو وشـــانە لە هەنـــدێ باردا دەوری جێنـاو دەبینن ، وەك ئەوەی لە ڕستەکانی : « هەموو ڕۆیشتوون » یان « کەس ڕۆیشت ؟ » ... دا ( هەموو ، کەس ) جێناون ، بەڵام بۆمان هەیە بپرسین لە ڕووی جێناو بوونو لەباری دیاریو نادیارییەوە جیاوازی لـە نێـوان وشەکانی ( هەرکەسێك )و ( هەر مرۆڤێك )و ( هــەر مشـــــــــکێك )و ( هەر دارێك ) ... دا چییە ؟ یاخـود ئەگەر ( پیـاو ) جێناو بێ ، ئـەی ( مەردم ، ئادەمیزاد ... ) بۆ جێناو نەبن ؟ ...

## جێنـــاوی لێکدەر ؟

هیچ یەکێك لە کوردناسانی سۆڤێت باسی ئەمەیان نەکردووە ـ واتـە وەك گروپێکی جێناو جیایان نەکردووەتەوە .

مامۆســــــتا تۆفیق وەهبی بەناوی « بۆناوی لێکدەر » ( ل ١٠٦ ـ ١٠٨ )ەوە بە دووری درێژی لێیدواوەو ( ی )و ( کە )ی بۆ ئەم گروپــە دیاریکردووە .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە ژێر ســـەرباسی « ڕاناوی گەیەنەر » ( ٩٩ ـ ١٠٠ )دا باســـیکردووەو ( ی ) ، ( کە ) ، ( یکە )ی بۆ ئـەم دەستەیە دەستنیشانکردووە .

لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕ بە ســـەرناوی « ڕاناوی لێکدەر » ( ل ٥٨ ـ ٦٣ )ەوە لەم باسەی کۆڵیوەتەوە : بـەلای دە نەسرین فەخریو مامۆستا صادق بەهائەدینەوە « تەنها وشەی ( کە ) ڕاناوە »و « ئەو پیتـە ( ی )ەی کە هەندێ جار دێتە پێش ڕاناوەکەوە پیتی پەیوەندییەو کـەرتی

ڕاناوەکە نییە » ( ل ٥٨ ) ... مامۆستا نووری عەلی ئەمینیش دەڵێ :
« پیتی ( ی ) یاخود ( کە ) ئەگەر بە تەنها هاتن هەر یەکەیان ئەو ڕاناوەن کە پێی دەڵێن ڕاناوی لێکدەر . بەڵام لەم حاڵەتەدا فەرقیان لەگەڵ حاڵەتی بەجووتە هاتنیان لە ڕستەدا ئەوەیە کە ( ی )ی تەنهاو ( کە )ی تەنها هەریەکەیان لەو شێوەیەدا ڕاناوی لێکدەری سادەیە ، بەڵام ئەگەر بەسەریەکەوە بەکارهێنران دەبنە ڕاناوی ناسادە » ( ل ٥٨ ) ... مامۆستا مەسعوود محەمەد ئەمە بە جێناو دانانیو بۆ بە جێناو دانەنانی گەلێ نموونەو بەڵگەی هێناوەتەوە .

من وای بۆ دەچم ئەمە تەفسیری زمانی ئینگلیزیو میجەر سۆن بێ لەسەر مامۆستا تۆفیق وەهبیو هی تۆفیق وەهبی لەسەر هەندێ لە زمانەوانانی لای خۆمان ... وەك ئاشکرایە : لە زمانی ئینگلیزیدا وشەکانی (Who, Whose, Whome) بە جێناوی لێکدەر دانراونو دیارە ئەمەش لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەوە هێنراوەتە ئەنجام ... ئەو جۆرە وشانە لە ئینگلیزیدا سەربەخۆیییان هەیەو لابردنیان مانای ڕستە دەگۆڕێ . هەرچی ( کە )ی کوردییە سەربەخۆیی تەواوی نییەو لابردنیشی هیچی ئەوتۆ لە ڕستە ناگۆڕێ . بەوێنە ، ئەگەر لە ڕستەی « من کە بۆ ئازادی بجەنگم ، لە مەرگ ناترسم »دا ( کە ) لە ڕستەکەدا هەبێو نەبێ واتاو مەبەست هەر یەکە .

بەکارهێنانی ئەم ( کە )یە وەك ئامرازی مەرجو ئامرازی پێوەندیو ... نەبینینی دەوری جێناو و ... مەودای بە جێناو دانانی کزدەکەن .

مێجەر سۆن چ لەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٩١٣[١٥٤]و چ لەوەیدا کــە ساڵی ١٩١٩[١٥٥] لەبارەی زمانی کوردییەوە بڵاوی کردووەتەوە باســـی جێناوی لێکدەری لــە زمــانی کوردیــدا کــردووەو وەك گروپێــك جیای کردووەتەوە . دوور نییە مامۆســـتا تۆفیق وەهبی کەوتبێتە ژێــر تەئسیری مێجەر سۆنەوەو مامۆستا نووری عەلی ئەمینیش کەوتبێتە ژێــر تەئسیری مامۆستا تۆفیق وەهبییەوە ...

شایانی باسە . کوردناسانی ئەم سەردەمەی ئینگلیز ( بــەتــایبــەتی د. مەکەنزیو د. ئەرنست مەکارۆس ) وا بۆی نەچوونو نەهاتوون بەرگی زمانی ئینگلیزی بکەنە بەر زمانی کوردی ... جا بۆیە بە هیچ چەشــنێك لە کارەکانیاندا باسی جێناوی لێکدەر نییە .

* * *

جێناو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیەو ئیشارەت بۆ دەلالەتو مــاددە دەکا ، بەڵام ناویان نابا ... جێناوی کەسی پێوەندیی کەس بەرانبــــەر بە قسەکەرو بەشداری کەری قسە نیشــــاندەدا . سێ کەس لە گفتوگۆدا نیشاندەدا : جێناوی کەسی یەکەم ـ قسەکەر ڕادەگەیەنێ ؛ جێناوی کەسی دووەم ـ ئەو کەسەیە کە قسەکەر ڕاستەوخۆ لەگەڵی دەدوێ ؛ کــەســـی سێیەم ـ ئەو کەسەیە کە لە گفتوگۆدا بەشداری ناکاو کەسەکانیتر باسی دەکەن ... جێناوی خۆیی پێوەندیی کارا بە بەرکارەوە ؛ نیهاد بە گوزارەوە ڕادەگەیەنێ ، بەتایبەتی یەككەوتنی نیهاد لەگەڵ گوزارەدا . جێناوی خۆیی

---

(154) E.B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913, pp. 29-30.

(155) E.B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar. Baghdad, 1919, p. 16.

( خۆ )ی کوردی دەتوانێ لەگەڵ هەرسێ کەســـی تاكو کۆی جێنـــاوی کەسیی جودادا ڕێكبکەوێ ، وەك : (من خۆم هاتم) ؛ ( تۆ خۆت هاتی ) ؛ ( ئەو خۆی هــات ) ؛ ( ئێمە خۆمان هــاتین ) ؛ ( ئێوە خۆتان هــاتن ) ؛ ( ئەوان خۆیان هاتن ) • بــەڵام لــە هەنــدێ زمــانی وەك ئەڵەمانیو فەرەنسی ••• دا جێناوی خۆیی هەر بە کەسی سێیەمەوە بەنـدە[156] ••• جێناوی نیشانەی ( ئەم ، ئەمە ••• ئەو ، ئەوە ) لەسەر بناغەی ئیشارەت بۆ شت یان چۆنیەتی دیاریکردن ، مانای شـــتو چۆنیەتی دەگەیەنێ • لەم حاڵەتانەدا بۆ تەواو گەیاندنی واتا ، ئیشارت دەور دەبینێ • بەوێنە ، کە دەوترێ : « بڕۆ بۆ ئەو ماڵە » ( بە دەست درێژکردن ئیشارەت دەکرێ ) یان ئەگەر بوترێ « ئەمە برامە » ( دەشێ بە سەر ئیشـــــارەت بکرێ ) یاخود یێتوو بووترێ : « ئەمە بالآیەتی » ( دەلوێ بە دەستبەرزکردنەوە نیشانبدرێ ) ••• ئەم جۆرە بەکارهێنانەی جێناوی نیشانە ، تایبەتــە بــە زمانی ئاخاوتن ، بەڵام لە زمانی نووسیندا دیاریکردنی واتای تەواویـــان لەسەر بناغەی تێکستەکە دادەمەزرێ • بۆ نموونە ( ئەم ) بۆ مەبەســـتی نزیك بەکاردێو ( ئەو )یش بۆ دوور ••• جێناوی ( کێ • چی ، کـــام ، چۆن ••• ) دەربڕینی تەقەلای قســـــەکەر دەگەیەنێ ، کە هاوبەشـــی بەشدارانی ئاخاوتنەکە شتێکی نائاشکرای لێ ئاشـــــکرابێ • جێناوی پرسیاری ( کێ ، چی ) پرسیاری کەسێك یان شـــــتێك دەکا ؛ ( چۆن ) هەواڵی چۆنیەتی دەپرسێ ؛ ( کوێ ) ـ جێگە ؛ ( کەی ) ـ کات •••

جگەر لەو دابەشکردنەی جێناو ، کە لــە ڕووی واتــاوە کـــراوە ، هەروەها دەشێ لە ڕووی پێوەندییەوە لەگەڵ بەشە ئاخاوتنەکـانی تــردا تەماشابکرێو ئەو جۆرانەی خوارەوەی لێهەڵبهێنجرێ :

---

(156) گ. ن. گفۆزدیێف ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، ب ١ ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٢٨٥ •

١ ـ جێناوی ناوی . وەك : ( من ، تۆ ، کێ ، چی •••و هەندێکی تر ) •

٢ ـ جێناوی ئاوەڵناوی ، ( ئەوە ، هی ، هەرکەس ••• و هەندێکی تر ) •

٣ ـ جێناوی ژمارەیی ، وەك : ( چەند ، هەندێ ، هیچ ••• و هەندێکی تر ) •

٤ ـ جێناوی ئاوەڵکاری ، وەك : ( کوێ ، هەمیشە ••• و هەندێکی تر ) •

# نیشــانــەی نموونــەکان


١ ـ ( بێکەس )

دیوانی بێکەس ، محەمەدی مەلا کەریم ڕێکی‌خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوەو سەرپەرشتیی لە چاپدانی کردووە ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٢ ـ ( پەندی پێشینان )

پەندی پێشینان ، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپی دووەم ، ١٩٧١ .

٣ ـ ( پەندی کوردی )

عومەر شێخەڵا دەشتەکی ، پەندی کوردی ، هەولێر ، ١٩٧٢ .

٤ ـ ( پیرەمێرد )

پیرەمێردی نەمر . محەمەد ڕەسووڵ هاوار ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

٥ ـ ( تحفەء مظفریە ، ب ١ )

ئۆسکارمان ، تحفەء مظفریە . بەرلین ، ١٩٠٥ ، پێشەکی‌و ساخکردنەوەو هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٦ ـ ( تحفەء مظفریە ، ب ٢ )

ئۆسکارمان ، تحفەء مظفریە ، بەرلین ، ١٩٠٥ ، پێشەکی‌و ساخکردنەوەو هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی ، بەشی دووەم ، بەغدا . ١٩٧٥ .

٧ ـ ( جزیری )

دیوانا مەلایێ جزیری . تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٨ ـ ( جگر خوین )

جگر خوین ، سەورا ئازادی ، شام ، ١٩٥٤ .

**٩ - ( جیمو گولپەری )**

جگر خوین ، جیمو گولپەری ، شام ، ١٩٤٦ .

**١٠ - ( خالید حسەین )**

چەند چیرۆك ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

**١١ - ( خانی )**

ئەحمەدی خانی ، مەمو زین ، ئەستەموول ، م. بۆز ئەرسەلان لە چاپی داوە .

**١٢ - ( زێوەر )**

دیوانی زێوەر ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

**١٣ - ( صەبری )**

عوسمان صەبری ، باهۆزو چەند نفیسارێن دی ، شام ، ١٩٥٦ .

**١٤ - ( فۆلكلۆر )**

فۆلكلۆری هۆراوەكانی كوردەواری ، كۆكردنەوەی محەمەد كەریم شەریف ، كەركوك ، ١٩٧٤ .

**١٥ - ( كوردۆ )**

كۆمەلە تێكستی فۆلكلۆری كوردی ، پرۆفیسۆر قەناتی كوردۆ لە زاری كوردەكانی سۆڤێتەوە تۆماری كردوە . شوكور مستەفاو ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی كوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

**١٦ - ( كۆیی )**

دیوانی حاجی قادری كۆیی ، گردو كۆو بلاوكەرەوە گیو موكریانی ، هەولێر ، ١٩٥٣ .

**١٧ - ( گۆران )**

سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەكەم ، دیوانی گۆران ، محەمەدی مەلا كەریم كۆیكردوەتەوەو ئامادەیكردوەو پێشەكیو پەراوێزی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

١٨ ـ ( گۆران ، ب )

گۆران ، بەهەشتو یادگارو فرمیسكو هونەر لەگەڵ دوو هاوێنــــە گەشت ، سلێمانی ، ١٩٧١ .

١٩ ـ ( لاوك )

سوارچاكی لە لاوكی كوردەواریدا ، محەمەد كــەریم شــــــەریف ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٢٠ ـ ( لە خەوما )

جەمیل صــــائب ، لە خەوما ، پێشكەش‌كردنو لێكۆڵینەوەی جەمال بابان ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٢١ ـ ( مەحوی )

دیوانی مەحوی ، لێكدانەوەو لێكۆڵینەوەی : مەلا عبدالكریمی مدرس‌و محمدی مەلا كەریم ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٢٣ ـ ( مەمێ ئالان )

مەمێ ئالان ، چیرۆك‌نفیس كۆی‌كردووەتەوەو پێشەكی بۆ نووسیوە ، صـــــالح عەلی گوللی‌و ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕێنووسی لاتینی‌یــەوە هێناویانەتە سەر ڕێنووسی كوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٢٣ ـ ( میهری )

دیوانی میهری ، بژاردن‌و ئامادەكردنی : عەزیز گەردی ، سلێمانی ، ١٩٧٧ .

٢٤ ـ ( نالی )

دیــوانی نالی ، لێكۆڵینــەوەو لێكدانەوەی : مەلا عبدالكریمی مدرس‌و فاتح عبدالكریم ، بەغدا . ١٩٧٦ .

٢٥ ـ ( هێمن )

تاریك‌و ڕوون ، گوڵبژێرێك لە شیعرەكانی هێمن ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

# سەرچاوە

## بــــە زمـــــانی کـوردی


(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، جێناوی کەسیی جودا لــە زمـــانی کوردیدا ، (( گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەســـتەی کورد )) ، بەشی یەکەم ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٤٥ ـ ٩٥ .

(٣) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، جێناوی کەســـیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی خوارودا ، گۆڤاری (( کاروان )) ، بەشـی یەکەم ، ژ ٣٣ ، هەولێر ، ١٩٨٥ ، ل ٢٧ ـ ٣٨ ؛ بەشـــی دووەم ، ژ ٣٤ ، هەولێر ، ١٩٨٥ ، ل ١٦ ـ ٢٥ .

(٤) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چی لەبارەی زمـــانی کـوردییـــەوە نووسراوە ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

(٥) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمـــانی کوردی ، بەرگی یەکــەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

(٦) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێنووســـــی کوردی لە ڕۆژنامەی (( تێگەیشتنی ڕاستی ))دا ، (( گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد )) ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٧٦ ـ ١٣٢ .

(٧) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبـــەر ڕۆشـــــنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٨) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو کارانەی لـــە مەیـــدانی لێکۆڵینەوەی (( جێناوی کەسیی لکاو ))دا کــراون ، گۆڤاری (( کاروان )) ، ژ ٢٩ ، هەولێر ، ١٩٨٥ ، ل ٢٢ ـ ٣٣ .

(٩) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

(١٠) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشـــــەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(١١) د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نووسانو پێکەوە نەنووسانەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٥٠ - ٤٨٨ .

(١٢) د. بەدرخان سندی ، ( ئەز ) ئو ( من ) د ئەزمانێ کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ١٣٣ - ١٥٣ .

(١٣) تۆفیق وەهبی ، ئەسڵی پیتە قاڵبی ( ئە )ی شێوەی سلێمانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٩ - ٣٨ .

(١٤) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .

(١٥) تۆفیق وەهبی ، خوێندەواری باو ، بەغدا ، ١٩٣٣ .

(١٦) جگەر خوێن ، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ .

(١٧) د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .

(١٨) حەسەنی قزلجی ، لەبارەی هێندێ لە نهێنیەکانی ڕێزمانی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣٥ - ١٧٦ .

(١٩) حەمیدی ئێزەد بەناهـ ، فەرهەنگی لەکو لوڕ ( لێدوانو بەراوردکردنی: مەحموود زامدار ) ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

(٢٠) ڕەئووف ئەحمەد ئالانی ، کێشەی نووسینی ڕاناوی لکاو ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٤ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٧٢ - ٧٣ .

(٢١) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٢) زاراوە زانستیەکان ، دانانو لێکۆڵینەوەی لیژنەی زاراوە زانستیەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٣) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .

(٢٤) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٥) صادق بەهائـەدین ئامێـــدی ، زمـــانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ١ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٩ ــ ٤١ .

(٢٦) صادق بەهائەدین ئامێـــدی ، گراماتیکا زمـــانی کوردی ، گۆڤاری « ڕوناهی » ، ژ ١ ، ساڵی ٢ ، بەغدا ، ١٩٦٢ ، ل ٢٤ ــ ٢٨ .

(٢٧) عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قامووسی زمـــانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٧ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

(٢٨) عەبدوڵلا ئالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سەندی ، زمانو ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی ســـێیەمی ناوەندی ، بەغـــدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی شـــەشـــەمی ئامادەیی ، بەغـــدا ، ١٩٧٦ .

(٢٩) فەیسەڵ مستەفا حاجی ، لە ڕێگای یەکگرتنی شـــێوەکانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەشی سێیەم ، ژ ٥٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٤٠ ــ ٤٢ ؛ بەشـــی چوارەم ، ژ ٥٥ ــ ٥٦ ، بـــەغـــدا ، ١٩٧٦ ، ل ٤٠ ــ ٤٢ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٥٧ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٦١ ــ ٦٣ .

(٣٠) د. قەناتی کوردۆ ، زمانی کوردی ، چاپی یەکەم ، یەریڤان ، ١٩٤٩ .

(٣١) د. قەناتی کوردۆ ، گراماتیکا زمـــانی کوردی ، چاپی ســـێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(٣٢) د. کوردستان موکریانی ، جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕســـتەی کوردیدا لـــە دیالێکتی کرمـــانجیی خواروو و کرمانجیی ژووروودا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٢٩ ــ ٢٥٤ .

(٣٣) لیژنەی زمانی کوردی ، بەراوردکاریی لە نێوان زارە کوردیەکاندا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٧٠ ــ ٣٣٧ .

(٣٤) لیستەی جوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، پێشەکیو ڕێکخســـتنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(٣٥) محەمەد ئەمین هـــەورامـــانی ، زاری زمانی کوردی لـــە ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ .

(٣٦) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

(٣٧) محەمەد ئەمین هەورامانی ، ( کـــە ) لـــە زمـــانی یەکگرتووی ئەدەبیی کوردیدا ، گۆڤـــاری (( کـــاروان )) ، ژ ١٢ ، هـــەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ١٩ – ٢٨ .

(٣٨) محەمەد مەعرووف فەتتاح ، خۆیەتی لـــە زاری ســـــلێمانیدا ، (( گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد )) ب ٧ ، بەغـــدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٦٢ ــ ١٩٥ .

(٣٩) مەسعوود محەمەد ، بەسەرداچوونەوە ، (( گۆڤاری کۆڕی زانیـــاری کورد )) ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ١٣٥ ــ ١٧٦ .

(٤٠) مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٤١) مەسعوود محەمەد ، سووڕێکی خامە بە دەوری ڕاناودا ، (( گۆڤـــاری کۆڕی زانیاری کورد )) ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٩ ــ ١٤٧ .

(٤٢) مەسعوود محەمەد ، لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەك ، گۆڤاری (( کاروان )) ، ژ ٢٠ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ١٧ ــ ٢٥ .

(٤٣) د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی ، ڕێزمانی کوردی بـــۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٢ .

(٤٤) نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

(٤٥) نووری عەلی ئەمین ، قەواعیدی زمانی کوردی لە ( صرف و نحو )دا ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٥٦ ; بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

(٤٦) د. وریا عومەر ئەمین ، پەیوەندی ڕانـــاوو فرمان لـــە کرمـــانجیی ژووروودا گـــۆڤـــاری (( کـــاروان )) ، ژ ٢ ، هـــەولێر ، ١٩٨٢ ، ل ٤٢ – ٤٣ .

(٤٧) د. وریا عومەر ئەمین ، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، گۆڤاری (( کاروان )) ، ژ ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٦٨ ــ ٧٤ .

## بـه زمـانی فارسـی

(٤٨) دكتر ابراهيم پور ، دستور زبان كردى ، تهران ؟

(٤٩) دكتر پرويز ناتل خانلرى ، تاريخ زبان فارسى ، جلـد اول ، ١٣٥٤ ، جلد دوم ، ١٣٥٤ ، جلد سوم ، ١٣٥٤ .

(٥٠) ذو النور ، دسـتور پارسى در صرف و نحو و املاى فارسى ، تهران ، ١٣٤٣ .

(٥١) سيد كمال طالقانى ، دستور زبان فارسى ، چاپ ششم ، ١٣٥١ .

(٥٢) على برناك ، دستور زبان فارسى ، ١٣٤٧ .

(٥٣) محمد كيوان پور ، نامهاى پرندگان در لهجههان كـردى ، تهـران ، ١٣٢٦ .

## بـه زمـانی عەرەبی

(٥٤) الدكتور ابراهيم انيس ، من اسرار اللغة ، الطبعة الرابعه ، القاهرة ، ١٩٧٢ .

(٥٥) الدكتور ابراهيم السامرائى ، فقه اللغة المقارن ، بيروت ، ١٩٦٨ .

(٥٦) الدكتور ابراهيم السامرائى ، مباحث لغوية ، النجف ، ١٩٧١ .

(٥٧) توفيق وهبى ، قواعد اللغة الكردية ، الجـــزء الاول ، الباب الثانى ، بيروت ، ١٩٥٦ .

(٥٨) عبدالباقى الصـــافى ، دراسة مقارنة للكلمة وعلم الصرف فى اللغتين العربية والانكليزية ، مستل من مجلة كلية الاداب جامعة البصـــرة ، العددان ٤ و ٥ .

(٥٩) عبدالمهدي مطر ، دراسات فى قواعـد اللغة العربية ، الجزء ١ ـ ٣ ، النجف ، ١٣٨٥هـ .

(٦٠) الدكتور على عبدالواحد وافى ، علم اللغة ، الطبعة السابعة ، القاهرة ، ١٩٧٢ .

(٦١) فتحيه توفيق صلاح ، التيسير فى النحو والصرف ، عمان ، ١٩٧٨ .

(٦٢) محمد سعيد عبدالرحمن ، قواعد اللغـة العربية فى النحو والصرف ، بغداد ، ١٩٧٠ .

## بـه زمـانی ڕووسی

(٦٣) ئۆ. س. ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

(٦٤) ك. ڕ. ئەیووبی‌و ئی. ئا. سـمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکـری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .

(٦٥) ئی. م. ئۆرانسکی ، زمانە ئێرانی‌یەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .

(٦٦) د. ن. ئوشاکۆف ، فەرهەنگی زمانی ڕووسی ، مۆسـکۆ ، بەرگی یەکەم ، ١٩٣٥ ؛ بەرگی دووەم ، ١٩٣٨ ؛ بەرگی سـێیەم ، ١٩٣٩ ؛ بەرگی چوارەم ، ١٩٤٠ .

(٦٧) چ. خ. باکاییێف ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان ، مۆسـکۆ ، ١٩٦٢ .

(٦٨) چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

(٦٩) چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .

(٧٠) س. ڤ. برۆملێی ، ل. ن. بوولاتۆڤا ، دەربارەی مۆرفۆلۆژیی بەشە دیالێکتەکانی زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ .

(٧١) پ. ئا. بوداگۆف ، خاسیەتی جێناوی کەسیی جودا ، مۆسـکۆ ، ١٩٥٨ .

(٧٢) ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

(٧٣) ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاسـت ، مۆسـکۆ ، ١٩٦٦ .

(٧٤) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسـکی ، سەرەتاییکی زمانناسـی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(٧٥) زارێ یوسـف ، ئەرکی جێناوی لکاوی ( ێ ) لە زمانی کوردیدا ، « کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، دووشـەمبە ، ١٩٦٦ ، ل ٣٢٥ ـ ٣٢٧ .

(٧٦) ل. ئی. زارێتسکی ، لەبارەی جێناوەوە ، گۆڤاری « زمانی ڕووسی لە قوتابخانە » ، مۆسکۆ ، ١٩٤٠ ، ژ ٦ .

(٧٧) ئا. ی. سامیرنیتسکی ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ .

(٧٨) س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .

(٧٩) ئا. ل. سوومیلینا ، کێشەی لێکدانەوەی کەسی سێیەمی جێناوی کەسیی جودا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ .

(٨٠) ڤ. ئا. ڤورۆنۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(٨١) ن. س. ڤالگینا ، د. ێ. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ڤ. ڤ. تساپکێڤیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ .

(٨٢) یو. ڤ. ڤانینکۆڤ ، م. ڤینیارسکی ، جێناوی کەسیی جودا لە زمانی ڕووسیو ئسپانیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ .

(٨٣) ئێ. م. ڤۆلف ، ڕێزمانو سیمانتیکی جێناو ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ .

(٨٤) ڤ. ڤ. ڤینۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ( مۆرفۆلۆژی ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ .

(٨٥) ق. کوردۆیێڤ ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

(٨٦) ق. کوردۆیێڤ ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

(٨٧) ق. کوردۆیێف ، زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .

(٨٨) ت. د. کۆرێلسکایا ، ێ. ڤ. پادووچێڤا ، لەبارەی جێناوی خۆیی و کەسیی و نیشانە لە زمانی ڕووسیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ .

(٨٩) ئێ. ئۆ. کۆستێنسکایا ، ڤ. ئی. کارداشێڤسکی ، ڕێزمانی فەرەنسی، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .

(٩٠) ئا. ن. گڤۆزدێڤ ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(٩١) ئا. ئی. گولانۆف ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

(٩٢) يو. ی. لێڤین ، لەبارەی واتای جێناوەوە ، مۆسكۆ ، ١٩٧٣ .
(٩٣) ئە. ئی. مایتینسکایا ، جێناو لە زمانانی خاوەن یاســـــای جودادا ، مۆسكۆ ، ١٩٦٩ .
(٩٤) د. مەكسیمی خەمۆ ، زمانی كوردەكانی بادینانی كوردستانی عێراق ، كتێبی « ولاتانو میللەتانی رۆژهەلاتی نێزیكو ناوەڕاست » ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٢٧٣ — ٢٨٢ .
(٩٥) ڤ. ن. یارخۆ ، ڤ. ئی. لۆبۆدی ، زمـانی لاتینی ، چاپی چوارەم ، مۆسكۆ ، ١٩٦٩ .

## بــە زمــانــە ڕۆژئاواییەكان

(96) G.O. Curme, A Grammar of English Language, London, N.-Y., 1931.

(97) Ernest N. Maccarus. A Kurdish Grammar, New - York, 1958.

(98) H.A. Gleason, Linguistics and English Grammar, New - York, 1966.

(99) James Sledd. A Short Introduction to English Grammar, Chicago, 1959.

(100) Joyce Blau. Manuel De Kurde, Paris, 1980.

(101) D.N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1957.

(102) D.N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961.

(103) Norman C. Stageberg, An Introductory English Grammar, New - York, 1965.

(104) E.B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad, 1919.

(105) E.B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(106) A.V. Williams Jackenzie, Avesta Grammar, Part I, Stuttgart W. Kohlhammer, 1892.

# ناوەرۆك

لاپــەڕە

لاپـــەرە

**– ٢ –**

DR. AWRAHMANI HAJI MARF

# KURDISH GRAMMAR

Volume I

( MORPHOLOGY )

Part II

— PRONOUN —

( In Kurdish )

Baghdad — 1987

---

لـه کتێبخانەی نیشتمانیدا

ژمـاره ( ٩٧ )ی ساڵی ١٩٨٧ی دراوەتێ

الجمهوريه العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
سلسلة رقم (١٥٨)

د. عبدالرحمن الحاج معروف

# قواعد اللغة الكردية

المجلد الاول

## (المورفولوجيا)

القسم الثاني

## - الضمائر -